

## نووســەر لــە چــەند دێڕێــک دا :

* ساڵی(١٩٤٧)لە گەڕەکی (بەفری قەندی) لە شاری کۆیە چاوی هەڵهێناوە.

* ساڵی (١٩٧٠) لە قوتابخانەکانی ناو شاری کۆیە بەمامۆستای (سروودو مۆسیقا) دامەزراوە.

* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی تیپی مۆسیقای باواجی کۆیە،کەلەلایەن دەزگای سینەماو شانۆ بەنووسراوی(٨٣٢) لە (١٩٧٢/٣/١) مۆڵەتی کارکردنی پێ درا.

* ساڵی (١٩٧٣) لەگەڵ کۆمەڵێ هونەرمەند بەشداری لە فێزدیفاڵی لاوان،کەلە(بەرلین) سازدرا،کردووە.

* ساڵی (١٩٧٥) لە خولێکی (مۆسیقا و ئاوازدانان) لە بەغدا بەشداری کردووەو لە نێوان چەندین دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا،بە پلەی (إمتیاز) دەرچووە.

* یەکێک بووە لە ئەندامە چالاکەکانی تیپی مۆسیقای شۆڕش لە نێوان ساڵی(١٩٧٤-١٩٧٥).

* سەرۆکی تیپی مۆسیقای هونەری هەولێر بووە لە ساڵی (١٩٧٦، تا ١٩٨٤).

* یەکێکە لە دامەزرێنەرانی (تیپی منالآنی هەولێر) کەماوەی چەندین ساڵ لەسەر ئاستی عیراقا بەیەکەم دەردەچوو.

* دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای خانزادی کچان بووە،ساڵی(١٩٨٠) و بەرەوژوور.

* ساڵی (١٩٧٨) ئەندامی وەفدی هونەری بوو، کە نێردراوە بۆ سوریا.

* لێپرسراوی تیپی مۆسیقای چالاکی قوتابخانەکانی هەولێر بووە. هەر لە ساڵی (١٩٧٦ تا ١٩٨٤).

* لە دوای ڕاپەڕین تیپی مۆسیقای(زیروبەم)ی دامەزراندووە کە چەند ، باج و خەلاتی لە فێستیڤاڵ و ئاهەنگەکانا وەدەست هێناوە.



ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر
لیژنەی چاپەمەنی
ژمارە (٥)



باڵەبان
وریا ئەحمەد
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
پیتچنین : نووسینگەی صلاح الدین بۆ کۆمپیوتەر
دەرهێنانی هونەری : عوسمان پیرداود
سەرپەرشتی چاپ : عەلی خورشید
چابخانەی وەزارەتی رۆشنبیری - هەولێر

پیشکەشە . . . بەگیانی پاکی ئەحمەدی حەمە مەلا



(تیپی موسیقای باوەجی کویە) ساڵی ١٩٧٣ تەلەفزیونی بەغدا.

ستودیوی ژمارە (٥)

## پێشەکی بەشی یەکەم

کۆمەڵێك هۆ پاڵیان پێوە نام بۆ ئەوەی ئەم کارەم ئەنجام بدەم .... لەوانە :
* هەژاری پەرتووکخانەی کوردیمان لە چاپەمەنی هونەری بەگشتیو هی گۆرانیو مۆسیقاش بە تایبەتی.
* ئەم دواییەدا هەر بینەریکی تەلەفزیۆنی کەرکوك هەستی بەوە کردووە کە بەرهەمەکانی نێوان ساڵەکانی حەفتاو بەرەو ژوور (مەبەستم بەرهەمە رەش و سپی یەکانە) بۆ نموونە بەرهەمەکانی تیپەکانی مۆسیقای(باواجی-تیپی هونەری هەولێر-سلێمانی-کۆمەڵ هتد ...)لەکاتی بلاو کردنەوەیان (١) گۆرانییەکان لە چەند جێیەك ڕادەوەستن و دەست بە هەڵپەڕین و لەرزین دەکەن و دەپچڕێن و دووبارە بەگەڕ دەخرێنەوەو ...

ئەم کارەش زۆر لایەنی هونەری بەرهەمە هونەریەکان بزر دەکات لەلایەك و وا لە بینەریش دەکات وەڕس بێت و هەوەسی تەماشاکردنی ئەم جۆرە بەرهەمانەی نەمێنێت لەلایەکی دیکەدا ... دوای چەند ساڵێکی دی ئەم بەرهەمانە بە یەکجاری لە کەڵك دەکەون و بەکاری بلاوکردنەوە نامێنن ... بۆیە بە پێویستم زانی گەر هیچ نەبێت هەڵبەست و نۆتەکانیان بمێنێت.
* ژمارەی منداڵان و لاوانی کورد ، ئەوانەی فێری مۆسیقا دەبن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زۆر بوون دایە ، جا بەڵکو ئەوانیش سوودێکی کەم تا زۆری لێ ببینن.

---

(١) هەرچەندە ئێستا بلاویش ناکرێتەوە.

# گۆرانی " پەیمان شکێن "

هەڵبەستی ئیبراهیم ئەحمەد
ئاوازی فۆلکلۆری
ئامادەکردن و گوتنی / وریا ئەحمەد

شەوی بە یادی ژینی ڕابوردوو
بەیادی عومری گوڵی بابردوو
سەری بکێشە هەوارگەی وێران
کە تاریکترە لە دیدەی کوێران

** **

بزانە مەستی شەڕابی چاوت
گیرودەی داوی ئەگریجەی خاوت
نە جێی تو خەمی گرتۆتە باوەش
زاری و بێ خەوی بوونە برابەش

** **

یاران هەر ئەوها پەیمان شکێنن
هەروا بێ قسەو وا بێ بەڵێنن
یا هەر تو وەهای توش لەبەختی من
ڕاستی پەیمانت لێ بوتە دوژمن

** **

---

ئەم گۆرانی‌یە (تیپی مۆسیقای باواجی کویە)ساڵی ١٩٧٢ بو تەلەفزیونی بەغدادی تومارکرد.
هەڵبەست و نوتەی ئەم گورانی یە لە گوڤاری کاروان ژمارە (٦) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî " peyman Şikên "

Helbestî : Bile ( Ibrahim Ehmed )
Awazi Folklorî
Amadekirdin û gutinî / Wirya Ehmed

Şewê be yadî jînî rabirdû
Be yadi umrî gulî babirdû
Serê bikêşe hewargey wêran
Ketarîktire le dîdey kwêran

* * *

Bizane mestî şerabî çawit
Gîrodey dawî egrîcey xawit
Le cêy to xemî girtote baweş
Zarî û bê xewî bûne bira beş

* * *

Yaran her awha peyman şikênin
Herwa bê qise u wa bê belênin
Yaher to wehay tosle bextî min
Rastî peymanit lê bote dujmin

## گۆرانی " لێم گەرێ "

هەڵبەستی/عەبدوڵلا پەشێو

ئاوازی/ وریا ئەحمەد

گوتنی / دلێر سادق

یم گەرێ ئەڕۆم ئەڕۆم تاکو هەم

ناگەرێمەوە بۆ باوەشی غەم

نیم گەرێ گیانە تو ئەم چاوانە

* *   * *

چیتر ئەم لاوە بەندەی جاران نیم

سەرمەستی بادەی خوای دڵداران نیم

نیم گەرێ گیانە ....

* *   * *

چیتر پیادەی ڕێی دڕکاوی نیم

وەك منالی چاو فرمێسکاوی نیم

نیم گەرێ گیانە ....

* *   * *

وەرە دڵم تیمارکە لە دڵداریم ڕزگارکە

گیانە وا گەرامەوە بەو سۆزە حەسامەوە

دە با بژی دڵداری سەرچاوەی بەختیاری

---

ئەم گۆرانیە تیپی باواجی ساڵی ١٩٧٢ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد.
هەڵبەست و نۆتەی ئەم گۆرانییە لە گۆڤاری کازوان ژمارە(٥) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî ( Lêm gerê )

Helbestî / Abdulla Peşêw
Awazî / Wirya Ehmed
Gutinî / Dilêr Sadiq

Lêmgerê erom  erom takû hem
Nagerêmewe bo baweşî xem
Lem gerê gyane . tu em çawane ...

* * *

Çîtir em lawe bendey caran nîm
Sermestî badey xway dildaran nim
Lem gerê gyane ...

Çîtir pyadey rêy dirkawî nîm
Wek minalî çaw firmêskawî nîm
Lem gerê gyane ...

* * *

Were dilim tîmar ke le dildarîm rizgar ke
gyane wa gera mewe .. bew soze hesamewe
Deba bijî dildarî .. Serçawey bextiyarî

# گۆرانی " قەتاری قولنگان "

ئاواز و هەڵبەستی کۆن
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
گوتنی / سەلاح محەمەد

بازان باز قەتار — قولنگان حەوایی
حەیفم بۆ بالاًت — شەو بە تەنیایی
دوگمەڵێ وەی وەی دوگمەڵێ — چەشمی سیا کۆچەڵێ
ئەم قەلە مەڕۆ مانگ هەڵێ — شەوێت دێمە باخەڵێ

** **

بە ماچ و دوو ماچ — لێت نابم ڕازی
تا لەسەر سینەت — نەیکەم دەسبازی
دوگمەڵێ وەی وەی دوگمەڵێ — چەشمی سیا کۆچەڵێ
ئەم قەلە مەڕۆ ئایشی — لە سەر سینەم ڕاکشی

---

ئەم گۆرانی‌یە تیپی باواجی ساڵی ١٩٧٣ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمار کرد.
هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە (٦) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî " Qetarî Qulingan "

Awaz û Helbestî Kon
Amade kirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî / Seleh Mihemed

Bazan baz qetar qulıngan hewayî
Heyfim bobalat şew be tenyayî
Dugmelê wey wey dugmelê
çeşmî sya koçelê
Em qele mero mang helê
Şewêt dême baxelê

* * *

Be maç û dû maç lêt nabim razî
Ta le ser sînet ney kem desbazî
Dugmelê wey wey dugmelê
çeşmî sya koçelê
Em qele mero mang helê
Şewêt dême baxelê

Andante

# گۆرانی " ڕەنگی زەردم "

هەڵبەست و ئاوازی/ فۆلکلۆری
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
گوتنی/ کۆرسی باواجی کۆیە

ڕەنگی زەردم بۆتۆ مردم — کوڵەجەکەی خامەکە
دەستم لە بۆ مەمکۆڵەی برد — گوتی هەتیو وامەکە
بە ماچ و دووماچ گیانەکەم — لێت نابم ڕازی
تا لە سەر سینەت چاوەکەم — نەیکەم دەسبازی
بە ماچ و دوو ماچ گیانەکەم — هیچت لێ نایێ
وا بزانە نان بوو دیدەکەم — دات وە گەدایێ
بەسەر گەردت بم گیانەکەم — نووری عەینەکەم
خۆ من بەبێ تۆ چاوەکەم — کوێرە زەینەکەم
کانیەکەی بەرماڵ گیانەکەم — زیخ دانە دانە
یارم دانیشتووە چاوەکەم — زولف ئەکا شانە

---

ئەم گۆرانی‌یە تیپی باواجی ساڵی ١٩٧٣ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمار کرد.
هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە (٥) دا بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî " Rengî Zerdim "

Helbest û awazî / Folklor
Amadekırdınî / Wirya Ehmed
Gutinî / Korsî Bawacî Koye

Rengî zerdim boto mirdim

Kolecekey xameke

Destim le bo memkoley bird

Gutî hetîw wa meke

Be maç û dû maç - Lêt nabim razî

Ta leser sînet - çawekem - nekem desbazî

# گۆرانی " پەروانە "

هەڵبەست و ئاوازی/ فۆلکلۆری
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
گوتنی/ ئیبراهیم سابیر

چاوی کاڵەو پرچی درێژە
کوشتوومت بۆ خۆت بمنێژە
بۆ ئەو یارە دێوانە بووم
ئەو شەمع و من پەروانە بووم

ئەمشەو جێژوان سەرەو لێژە
دێوانە بووم من دێوانە بووم
ئەو شەمع و من پروانە
چی بوو لە پێر بێگانە بووم

* * * *

هەروا دەڕوا دەڵێی پۆڕە
توخوا جوانی دڵ مەگۆڕە

گوارەی ئاڵتوون لە گوێی شۆڕە
دێوانە بووم من . . .

* * * *

هەروا دەروا شیلان شیلان
بەقامەکەن بەکچە تیوان

بۆ خۆی یەکەو دۆستی چلان
دێوانە . . .

---

ئەم گۆرانی‌یە تیپی باواجیساڵی ١٩٧٣ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمار کرد.
هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە (١٠) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî “ Perwane ”

Helbest û awazî / Folklor
Amade kirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî / Ibrahîm Sabîr

Çawî kale u pirçî drêje
Emşew cêjwan serew.lêje
Kuştûmit bo xot bimnêje

Dêwane bûm min dêwane bûm
Bo ew yare dêwane bûm
Ew şem u mın perwane bûm
Çîbû le pêr bêgane bûm
Dêwane bûm min dêwane bûm

*  *  *

Herwa derwa delêy pore
Gwarey alitûn le gwêy şore
Tuxwa cwanê dil me gore

Dewanê bûm min .....

MAESTOSO ♩ = 88

# گۆرانی "جوانی کوێستان"

هەڵبەستی / جەلال جوبار
ئاوازی/ فۆلکلۆری
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
گوتنی/ سەلاح محەمەد

بابچینە کوێستان بۆ گەشتی ئەم ناوە
جوانی جیهانی خوا بەم شێوێنە داوە
ئەم ناوچە جوانە شوێنی کۆچەریانە
هۆبە بە هۆبە ڕەشماڵیان هەڵداوە
تا چاو لێی دیارە چیمەن و گوڵزارە
پڕ جۆگە و کانی و ڕوباری بەفراوە
لە چلەی هاوینا نەوبەهار ببینە
قەندیل مەندیلی هەر فڕێ نەداوە
بلوێری شوانی لە بەرزی تەلانی
کیژ لەسەر کانی دێنێتە سەماوە

* *  * *

ئەم گۆرانییە جاری یەکەم سالی ١٩٧٤ واتە لە فێستیفالی یەکەمی هونەری کوردی دا بە دەنگی (سەلاح پشدەری)، تیپی باواجی پێشکەشی کرد، وە دوا جار تیپی هونەری هەولێر سالی ١٩٧٨ بە دەنگی (سەلاح محەمەد) بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد. هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە (٧) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî " Cıwanî Kwêstan "

Helbestî / celal cobar

Awazî / Folklor

Amadekirdinî / Wirya Ehmed

Gutinî / Selah mihemed

Ba bçînc kwêstan bo gestî em nawe

Cwanî cîhanî xwa bem swêne dawe

Em nawçe cwane swênî koçeryane

Hobe be hobe reşmalyan heldawe

Ta çaw lêy dyare çîmen û gulzare

Pir coge u kanî û rûbarî befrawe

Le çley lawîna newbehar bıbîne

Qendîl mendîlî her frê ne dawe

LARGO

ba bçî ne kwês ta bo ges tî em na we cwa ni cî ha- ni xwa

bem swê ne da- we

Fin

# گۆرانـــــیٚ " دیـــــدەم زارا"

ئاوازهەڵبەســـــتی/ فۆلکلـــــۆر

ئامـــادەکردنی / وریـــا ئەحمـــ

گوتنـــــی/ ســــەلاح پشــــدەر

ئای زارا دیدەم زارا بەم ئێـوارە بـن لەنگێنـە لـەنگاندن وادەبیٚ

لەبــەر ئــەو گــۆزەی دەمــرم لــە ســەر شــانی بــەند دەبــیٚ

**  **

کراســـێکی لەبـــەر دایـــە کـــەس نـــازانیٚ چ ڕەنگــــــە

وەکـــو ڕادیـــۆ بـــاس ئـــەکا ئـــەڵێن کـــاری فەڕەنگـــــــە

**  **

وەرن جـــەرگم هـــەڵدڕن بزانـــن چیـــم لـــە دڵـــی دایـــــە

هـــەمووی دەردو حەســـــرەتە لـــە تـــاو دووری لەیلایـــــە

**  **

---

ئەم گۆرانییە تیپی باواجی ساڵی ١٩٧٤ واتە لە فێستیفاڵی یەکەمی هونەری کوردی دا لە بەغدا بە دەنگی ...ەڕاو پێشکەشی کرد.

...جار تیپی مۆسیقای سلێمانی ساڵی ١٩٧٨ بە دەنگی (کامەران مەجید) بۆ تەلەفزیۆنی بەغدایان تۆمارکرد. ...ەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە(١٠) دا بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî “ Dîdem Zara ”

Awaz û helbest / Folklor
Amadekirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî / Selah Pisderî

Ay zara dîdem zara bemêware bîlengêne

lengandin wa debê

Leber ew gozey demrim le ser şanî bendebê

* *     * *

Kraseki leber daye kes nazanê çirenge

We kû radyo bas deka Elên karî ferenge

* *     * *

werin cergim heldirin bzanin çım ledilîdaye

Hemû derd û hesrete le taw dûrî ley laye

# گۆرانی " گلەیی لە کەس ناکەم "

هەڵبەست/پیرەمێرد
ئاواز/ کوردی
ئامادەکردنی/وریا ئەحمەد
گوتنی/دڵشێر سادق

گلەیی لە کەس ناکەم بۆ بەختی خۆم ئەگریێم
دڵی خۆم بۆ تۆ هانی زاڵم قەدرت نەزانی

* * * *

دایم دڵم دەشکێنی ڕۆژێك ئەبی نامبێنی
دێی دەگەڕێی لە شوێنم ئەوساکە من ناتبینم
گلەیی لەکەس . .

* * * *

شەرتبی ڕۆژێکم مابێ نەهێڵم دڵمت لابێ
هێندەی لێ پاڕامەوە ڕووی نەکرد بەلامەوە
گلەیی لەکەس . .

* * * *

ئاهم گرفتاربی لای عەشقم شەرمەزاربی
چاوکاڵ لەتۆ تۆراوم دڵم تەنگەو گریاوم
گلەیی لەکەس . .

---

ئەم گۆرانییە تیپی باواجی ساڵی ١٩٧٤ واتە لە فیستیفاڵی یەکەمی هونەری کوردی دا لەبەر چەند هۆیەکی هونەری نەیتوانی پێشکەشی بکات.
هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە (٧) دا بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî " Gileyî le kes nakem "

Helbest / Pîre Mêrd
Awaz / Kon
Amadekirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî / Dilêr sadik

Gileyî le kes nakem
Bo baxtî xom egiryem
Dilî xom boto hanî
Zalim qedrit ne zanî

* *     * *

Dayîm dilim deşkênî
Rojêk ebê nam bînî
Dêy degerêy le şwênim
Aw sake min natbînim

Gileyî le kes . . .

* *     * *

Be Ahim girftar bî
Lay eşkim şermezar bî
Çaw kal leto to rawim
Dilim teng û giryawim

Gileyî le kes . . .

ئاوازی/وریا ئەحمەد – سالی(١٩٧٠) لەگەل فلووت ژەن و شمشال ژەنی کەیە سەردار ئەحمەد بو ئیسگەی کوردیمان تومارکرد.

" موسیقای حەمامۆك "

بتعرف

𝄋 De Tempo

(١) (٢)



( تیپی هونەری هەولێر ) ئاهەنگێکی سالی (١٩٧٨) هۆڵی گەل / هەولێر



( تیپی هونەری هەولێر ) لە ئاهەنگی یەکیەتی نەقابەکانی کرێکارانی هەولێر سالی ١٩٧٨

## گۆرانی " ئەو چاوانەی هەڵیان دێنی "

ئاوازی/ وریا ئەحمە
ئامادەکردنی هەسە
و گوتنی: ئیبراهیم سـ

ئەو چاوانەی هەڵیان دێنی
بەکل و دەرمان دەی ڕازێنی
رۆژ نیە مردووم لێ نەمرێنی
بۆ لێم زیر بووی نام دوێنی

ئەو چاوانەی . .

* *   * *

چاوت ئەستێرەی ناو وەردان
بە مەرقەدی هەیبە سوڵتان
چەن ناخۆشە دەس لێك بەردان
بۆ تۆ مردم کچە جیران

ئەو چاوانەی . .

* *   * *

چاوت باز ئەبرۆت کەوانە
وەختە بۆت بم بە دێوانە
بۆ تۆ مردم چەند زەمانە
چەند شیرین و میهرەبانە

ئەو چاوانەی . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر سالی ۱۹۷۷بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد .

# Goranî " Ew Çawaney Hêlyan dênî "

Amadekirdin û helbest û
Gutinî / Ibrahim Sabîr
Awazî / Wirya Ehmed

Ew çawaney helyan dênî
Be kil û derman deyrazênî
Roj nîye mirdûm lê nemrênî
Bo lêm zîz bûy namdwê nî
Ew çawaney . . .

* *   * *

Çawit estêrey naw werdan
Be merqedî heybet sûltan
Çend naxoşe deslêk berdan
Boto mirdim kiçe cîran

* *   * *

Çawit baze ebrot kewane
Wexte bot bim be dêwane
Boto mirdim çend zemane
Çend şîrîn û mîhre bane
Ew cawaney . . .

# گۆرانی " خەجێ "

گوتنی / سەلاح محەمەد
ئاواز و هەڵبەستی / کۆن
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد

چەندم پێ گوتی کچی خەجی  مەچووە بیتوێنی
ئاوی نا سازە کچێ خەجێ  هەر دەت فۆتێنێ

* *   * *

کەپرێکت بۆ بکەم کچێ خەجی  لە قولەی دەربەندی
دێمە لای دایکت کچی خەجێ  بە زاوا بەندی

* *   * *

کەپرێکت بۆ بکەم کچێ خەجێ  لە ناو تووتنێ
دە هاوێمە کەپرێ کچێ خەجی  پەلکی سوسنێ

* *   * *

بە هارێ نامرم کچێ خەجێ  شایی و سەیرانە
هاوینێ نامرم کچێ خەجێ  خەڵە و خەرمانە
پایزێ نامرم کچێ خەجێ  گەڵا رێزانە
زستانێ نامرم کچی خەجی  بەفرو بارانە
ئەو وەختەی دەمرم کچێ خەجێ  دەست لێك بەردانە

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٧ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد.
[illegible]ست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٣ ) دا بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî " Xecê "

Gutinî / Selah Mihemed
Awaz û Helbestî / Kon
Amadekirdinî / Wirya Ehmed

Çendim pê gutî - meçwe bitwênê
Awî nasaze kiçê xecê - her det fewtênê

* *   * *

Keprê kit bo bikem - kıcê xecê lequley derbendî
Dême lay daykit - kiçê xecê - be zawa bendî

* *   * *

Hawînê namrım - kiçê xecê - xele û xermane
Payîzê namrim - kiçê xecê - gela rêzane

* *   * *

Zistanê namrim - kiçê xecê - befrû barane
Ew wextey demrim - kiçê xecê - dest lêk berdane

# گۆرانی " شیرنێ لەیلانێ "

هەڵبەست و ئاوازی: کورد
ئامادەکردنی وریا ئەحمەد
گوتنی تاهیر توفیق

شیرنێ لەیلانێ لەیلانێ … شیرنێ بابچینە سەیرانێ

* *  * *

قەسەم بەو باڵای چین چینت … بەم ئەگریجەی ژێر پۆشینت
کافر بووم هاتمە سەر دینت … شیرنێ لەیلانێ

* *  * *

چاوی بازت بە خومارەوە … مەمکت سێوە بەدارەوە
خوا پێی داوی مەی شارەوە … شیرنێ لەیلانێ . .

* *  * *

جووتێ ساقی گوارە زێڕن … مەی لە مەیخانێ دەگێڕن
عاشقان لە دین وەر دەگێڕن … شیرنێ لەیلانێ . .

* *  * *

قوربانت بم ئەی بای شەوێ … خەوبێ لە چاوم ناکەوێ
دڵ مەجنوونەو لەیلای دەوێ … شیرنێ لەیلانێ . .

---

ئەم گورانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٧ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد .
هەڵبەست و نۆتەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە(١٣) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî " Şirnê Leylanê "

Helbest û awazî / Kon
Amadekirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî / Tahîr tofîq

Şîrnê leylanê lelanê

Şîrnê bebçîne seyranê

* *     * *

qesem bew balay çin çînit

Bem egrîcey jêr poşînit

Kafir bûm hatime ser dînit

Şîrnê leylanê . . .

* *     * *

Çawî bazit be xumarewe

Memkit sêwe be darewe

Xwa pêy dawî mey şarewe

Şîrnê leylanê . . .

# گۆرانی " عەزیزم بەیانی "

هەلبەست و ئاوازی/ کۆ

ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد

گوتنی/خوالێخۆشبوو/ ئازاد کەریم

عەزیزم بەیانی کە گوڵ عەترێ دەڕێژێ

کە بولبول دەناڵێ کە سۆفی دێنە نوێژێ

لە کونجێ قەفەز دام بەسەد ناڵە دەخوێنم

هەناوم نەماوە لە بەرچی نایە شوێنم

لە هیجرانی ویساڵت لە دەوری خەت و خاڵت

هەتا هەم دەخوێنم دەناڵێنم

هەتا نێو گوڵی خۆم وەدەست دێنم

خەزێمی خەزێم گیان لە بەرچی نایە شوێنم

لە بەر چاوی جوانت لەبەر جەرگی بەخوێنم

* *    * *

گوڵ و لالە پشکووت دەور دەوری گوڵانە

گوڵی من دەپشکوێ بەهاری دوو دڵانە

* *    * *

کە بولبول دەناڵێ دەڵێ کوا گوڵی سوورم

هەناوم نەماوە دەمێکە لە تۆ دوورم

دەڵێن ئەورۆ بەهارە بەهاری دوو دڵانە

کە بولبول دەکا ڕازی دڵداری

لەگەڵ کۆنە یاری جەفا کاری

بەهارە عەزیزم بەهاری دوودڵانە

کە بولبول دەخوێنێ لەسەر پەلگی گوڵانە

عەزیزم بەیانی . . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٧بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد .
نۆتە و هەڵبەستەکەش لە گۆڤاری کاروان ژمارە(١٤) دا بلاوکراوەتەوە.

گۆرانی بێژی جوانەمەرگ" ئازاد کریم " لە ( ١٩٥٥/١٠/٣)لە گەڕەکی " تەعجیل " لە شاری هەولێر لە دایك بووە
لە ڕۆژی (١٩٧٨/١٢/٩)یشدا بەکارەسەتی ئوتومبیل سەری نایەوە ، شایانی باسیشە کە خوالێخۆشبوو ئەمە یەکەم
گۆرانی و دوا گۆرانی بوو لە ژیانیدا بۆ ئێستگەو تەلەفزیۆنی تۆمارکرد.

# Goranî " Ezîzîm Beyanî "

Helbest û awazî / Kon
Amadekirdinî / Wirya Ehmed
Gutinî (xwa lê xoş bû ) /Azad Kerîm

Ezîzim beyanî ke gul etrê derê jê

Ke bulbul denalê ke sofî dêne nwêjê

Le kuncî qefesdam be sed nale dexwênim

Henawim nemawe leberci nayes wenim

Le hîcranî wîsalit le dewrî xetû xalit

Heta hem dexwênim denalênim

Heta nêw gulî xom wedest dênim

Xezêmî xezêm gyan lebeçinaye şwênim

Leber çawî cwanit le ber cergî bexwênim

# گۆرانی " بەناز گیان "

ئاوازی /فۆلکلۆری
ئامادەکردنی هەڵبەست
و گوتنی / حەمە جەزا
ئامادەودابەش کردنی / وریا ئەحمەد

ئەریٚ چەندم پیٚ‌گوتی گیانە بە تەگبیرم بی
ئەریٚ بەقسە و نەکردم نازەنین خودا گیرم بی
ئەریٚ بەناز گیان بەناز کچیٚ بەنازت کردم
ئەریٚ منداڵی دوێنێم گیانە تۆ پیرت کردم

* * * *

ئەریٚ هێشتا لەگەڵما گیانە دڵ پڕ لە قینی
کچیٚ موبارەکت بیٚ گیانە ئەڵقەی بوکێنی
ئەریٚ بەناز . . .

* * * *

ئەریٚ چەن ساڵ بەتێری نازەنین عەشقت ڕەنجەڕۆم
ئەریٚ ئەوە لە داخت گیانە باردەکەم دەڕۆم
ئەریٚ بەناز . . .

* * * *

ئەریٚ هەرکەس عاشقە جوانیٚ وەکو من نەبیٚ
کچیٚ گیرۆدەی داوی جوانیٚ پەرەی دڵ نەبیٚ
ئەریٚ بەناز . . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٧بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد .
... و هەڵبەستەکەشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٣ ) دا بلاوکراوەتەوە.

## Goranî " Benaz Gyan "

Awaz : Folklor
Amadekirdinî û helbestû
Gutinî / Heme Ceza
Amade û dabeşkirdinî / Wirya Ehmed

Erê cendim pê gutî
gyane be tekbirim bî
Erê beqset ne kirdim
Nazenîn xudagîrim bî
Erê benaz gyan abenaz kiçê benazit kirdim
Erê mindalî dwênêm gyane to pîrit kirdim

* * * *

Erê hêsta le gelma gyane dilpir le qînî
Kiçê mubarekit bê gyane elqey bûkênî
Erê benaz . . .

* * * *

Erê çend sal betîrî nazenin eşqit rencerom
Erê ewe le daxit gyane bar dekem de rom
Erê benaz . . .

# گۆرانی " بەنازی کچی بەنازی "

هەلبەستی / کەریم شـ
ئاوازی/ فۆلکلـ
ئامادەکردنی / وریا ئەحـ
گوتنی / حەمـە جـ

بە نـازی کچـی بـەنازی　　تـۆ چـاو شـەهێن و بـازی
بـالاّ بـەرزو شـۆخ و شـەنگ　　چـەند دلّگیرو دلّخـوازی

* *　* *

خەونی خۆش و لاوێنیم خۆشەویستی و خاوێنیم
هیوا و ئاواتی دلّم گولّی گەشی زاوێنیم
بـەنازی کچـیّ . . . .

* *　* *

تـۆ کـام شـۆخی کـام زێـڕی یاکـام وێنـەو پەیکـەری
ڤینۆسی خوای جوانی تۆ ئینسانی یاپـەری
بـەنازی کچـیّ . . .

* *　* *

گـەردن بـە خـالّی کـەونی هـەرچی بلّێـم تـۆ ئـەونی
پەری جوانی ئەڤینی یانە خـەیالّ و خـەونی ؟
بـەنازی کچـیّ . . .

---

ئەم گورانی یە تیپی هونـەری هـەولێر سـالّی ١٩٧٧ بۆ تەلـەفزیۆنی کـەرکوکی تۆمـارکرد .

# Goranî " Benazî Kiçê Benazî "

Helbestî / Kerîm Şareza
Awazî / Folklor
Amadekirdinî / Wirya Ehemd
Gutinî / Heme Ceza

Benazî kiçê benazî
To çaw şehênu bazî
Bala berzu şoxu şeng
Çend dilgîr u dilxwazî

* *     * *

Xewnî xoş u lawênîm
Xoşewîstî u xawênîm
Hîwa u awatî dilim
Gulî geşî zawênuîm

Benazî kiçê . . .

* *     * *

To kam şoxî kam zêrî
Ya kam wêne u peykerî
Vînosî xway cwanî
To insanî ya perî

Benazî . . .

# گۆرانـــی " ئاییـــه و ئۆییـــه "

هەڵبەست و ئـاوازی / فۆلكلـۆر
ئامـادەكردنی / وریـا ئەحمـەد
گوتنـی : ئیـبراهیم سـابیر

شـەوان شـەو ناڵـەو ڕۆژان ڕۆڕۆمـە
یـەكجار پـەژارەی دووریەكـەی تۆمـە
عەشقی دوو چـاوانتم شێتی ووردە خـاڵتم
ئاییـە ئۆییـە هـەولێری یـەو كۆییـە
بـە بـەژن و بـاڵای لاولاوی
هـەردەڵێی كیـژە كۆییـە

* * * *

شـارەكەی كۆیـەم ڕازاوە بـەگوڵ
ئـارەق دەڕێـژم زەنگـوڵ بـە زەنگـوڵ
هـەرتۆم خـۆش دەوێ بـەگیان و بـەدڵ
عەشقی دوو چـاوانتم . . .

* * * *

تاكەی لە كوێ بـووی كـزەی جەرگەكـەم
لـە جیـاتی نـان و ئـاو و بەرگەكـەم
عەشـقی دوو چـاوانتم . . .

* * * *

هـەتا مـەیلت بـوو بـە مـەیلت دوام
ئێسـتاش بـێ مـەیلی ئـەمنیش دڵنیـام
عەشـقی دوو چـاوانتم . . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونـەری هـەولێر سـاڵی ١٩٧٧بۆ تەلـەفزیۆنی كـەركوكی تۆمـاركرد .

# Goranî " Ayîye u Oyîye "

ielbest u Awazî / Folklor
madekirdinî / Wirya Ehmed
jutinî / Ibrahîm Sabîr

Şewan şew naleu rojan roroma
Yekcar pejarey dûryekey to me
Aşkî dû çawanitim şêtî wirde xalitim
Ayîye oyîye Hewlêrîye u koyîye
Be bejn u balay lawlawî
Her delêy kîje koyîye

* *     * *

Şarekey koyem razawe begul
Areq derêjim zengul be zengul
Her tom xoş dewê begyan u bedil
Aşqî du çawanitim . . .

* *     * *

Takey lekwê buy kizey cergekem
Le cyati nanu aw u berge kem
Aşkî dû çawanitim . . .

## گۆرانی " خرینگە "

هەڵبەست و ئاوازی / فۆلکلۆر
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
رزگار خوشناو
گوتنی جەعفەر سەفا

هەی خرینگە خرینگەی ناو گولان
دەم لە ناوی دەم دەس لە مەمکۆلان
زۆرم نەماوە بمنێن لە قەفەس
ئەچا و تێردەبێ نە دڵ دەڵێ بەس
ئەشقی ئەو یارەم تا ئاخیر نەفەس
هەی خرینگە . . .

* * * *

هەی دادو بێ داد ئالودەی دەردم
بۆ ڕوحمێ ناکەی بەڕەنگی زەردم
منداڵی دوێنێم تۆ پیرت کردم
هەی خرینگە . . .

* * * *

دەترسێم بمرم بە جوانە مەرگی
بمنێنە ژێر خاك ناڵەی دڵتەنگی
هەی خرینگە . . .

* * * *

هەی دادو بێداد کەس دیار نیە
کەس لە دەردی کەس خەبەر دار نیە
ئەمنی کوشتووە ئاگای لێم نیە
هەی خرینگە . . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی میللی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .
نۆتە و هەڵبەستەکەشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٦ ) دا بلاۆکراوەتەوە.

# Goranî " Xrînge "

Helbest û awazî / Folklor
Amadekirdinî /
Wirya Ehmed - Rızgar Xosna…
Gutinî / Cafar Selîm

Hey xrînge xrîngey naw kolan
Dem le nawî dem des le mem kolan
Zorirm nemawe bimnên le qefes
Ne çaw têr debê ne dil delêe bes
Aşkî ew yarem ta axir nefes
Hey xrînge . . .

*   *   *

Hey dadû bê dad alûdey derdim
Bo ruhmê nakey berengî zerdim
Mindalî dwênêm to pîrit kirdim
Hey xrînge . . .

*   *   *

Detirsim bimrim becwane mergî
Bimnêne jêr xak naley diltengî
Hey xringe . . .

---

♩=120

He xrin ge da de xrin gew xrin gey naw gu lan

# گۆرانی " کۆلانی تەنگەبەر "

هەڵبەست و ئاوازی : فوئاد
ئامادەکردنی
وریا ئەحمەد و رزگار خۆشناو
گوتنی / حەمە جەزا

لە کۆلانی تەنگەبەر شان مەدە لە شانم

ڕووت وەرمەگێرە ئەسمەر خەڵکی لای خۆتانم

** **

لە کۆلانی بەرماڵتان ئەتبینم جاروبار

من شێتی باڵای تۆ بووم هەی شێتی نالەبار

** **

لە کۆلانی بەرماڵتان شاییەو هەڵپەرکێ

گشت خەڵکی شادن من ماڵم وێرانە

** **

لە کۆلانی پێش ماڵتان شاییەو هەڵپەرکێ

کیژ لەگەڵ کوڕان دەکەن چاوبڕکێ

---

ئەم گورانی یە تیپی میللی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .
نۆتە و هەڵبەستەکەشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٧ ) دا بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî " Kolanî Tengeber "

Halbestû awazî / Folklor

Gutinî / Hema Ceza

Amadekirdinî /

Wirya Ehmed - Rizgar Xoşnaw

Le kolanî tengeber şan mede le şanim

Rût wermegêre esmer xelkî lay xotanim

* *   * *

Le kolanî ber maltan etbinim car û bar

Min şêtî balay to bûm hey şêtî nale bar

* *   * *

Le kolanî ber maltan şaîye u helperkê

Gişt xelkî sadin min malim wêrane

# گۆرانی " پرچی پەخشانە "

هەڵبەست / جەلال جوب
ئامادەکردنی ئاواز / وریا ئەحم
گوتنی / ئیبراهیم س

یارم بێ شانە پرچی پەخشانە
بەسەر کۆڵوانە شاڵی سەرشانە
مەزەی چاوانە قیبلەی لاوانە
کارمامزەکەی دەم چۆم و ئاوانە

* * * *

وێنەی بێ گەردی پڕ لەخاڵ ووردی
لەگەڵ ملوانکەی گەردەنی زەردی
کە سەیری دەکەی بە بەرگی کوردی
نازانی دڵت کامیان بوو بردی

* * * *

گیان سووك و ناسك چەند خنجیلانە
قۆلنگی پێشەنگی قافلەی مەلانە
خەرمانی گولاڵە مەڵبەندی دلانە
قەشەنگ ڕسکاوی نەخشی یەزدانە

* * * *

---

ئەم گۆرانی یە تیپی میللی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد.
نۆتە و هەڵبەستەکەشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٦ ) دا بلاوکراوەتەوە.

## Goranî " Pirçi Pexşane "

Helbest / Celal Cobar
Amade kirdinî awaz
Wirya Ehmed
Gutinî / Ibrahîm Sabir

Yarim bê şane pirçî pexşane
Be ser kolwane şalî ser şane
Mezey çawane qibley lawane
Karmam zekey dem çom û awane

* * *

Wêney bê gerdî pir xalî wirdî
Le gel milwankey gerdinî zerdî
Ke seyrî dekey be bergî kurdî
Nazanî dilit kamyan bo birdi

* * *

Gyan sûk û nasik çend xincîlane
Qulingî pêşengî qafley melane
Xermanî gulane melbendî dilane
Qeşeng rIskawî nexsî yezdane

# گۆرانی " بلوێری شوان " [1]

ئاوازی / فۆلکلۆر
هەڵبەستی / هێمن
ئامادەکردنی / وریا ئەحمەد
گوتنی / تەنیا عارەب عوسمان

توخوا شوانان هەموو شەوێ
لە نیوە شەو کاتی خەوێ
لێکیان کردین کۆسیان کەوێ

* * * *

هەزار خۆزگەم بەوەی شوانە
کە بەو مانگە شەوە جوانە
دانیشتبێتینە دەس لە ملانە

* * * *

نیوە شەوە دنیا خامۆش
دێتە گوێم ئاهەنگێکی خۆش
دێتە گوێم ئاهەنگێکی خۆش

* * * *

خۆزگەم بە دوێنێ نیوەڕۆ
چاو جوانیان برد بۆ تانجەڕۆ
گوڵیان لۆ کرد لە گوڵی لیمۆ

---

ئەم گۆرانی یە تیپی میللی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .

(١) گۆرانی سەرەوە لە بەرهەمی شاعیری پایەبەرز(هێمن)ە و لە کتێبی(تاریك و ڕوون) لاپەڕە(٨٩)دا بلاوکراوەتەوە ، بەلاّم ئەوەی جێگەی داخە گۆرانی بێژی ناوبراو هەندێ گۆڕانکاری تێدا کردووە بۆ ئاگاداریتان.

# Goranî : “ Bilwêrî Şiwan "

Awaz / Folklor
Helbest / Hêmin
Amadekirdin / Wirya Ehmed
Gutin / Tenya Areb Osman

Tuxwa şiwanan hemû şewê
Le nîwe şew katî xewê
Lêkyan kirdîn kosyan kewê

* * *

Hezar xozgem bewey şiwane
Ke bew mange şewe cwane
Danîştine des le mi la ne

* * *

Nîwe şewe dinya xamoş
Dête gwêm ahengêkî xoş
Dête gwêm ahengêkî xoş

* * *

Xozgem bedwênê nîwero
Çaw cwanyan bird bo tancero
Gulyan bo kird le gulî lêmo

## گۆرانی " سەلام "

ئاوازی فۆلکلۆر
ئامادەکردنی/ وریا ئەحمە
ئامادەکردنی هەلەمە
و گوتنی/ ئیبراهیم سا

پێم خۆشە وەك ڕاوچی‌یان بم کوژی یەك ساچمە
ئەم ساڵ سەری حەو ساڵە ئارەزووی سێ ماچمە
خاکی کۆیە ئی من بێ بەبێ ئەو گوڵەی بۆ چیمە
ئۆف سەلام گیان سەلام سەلام لە یاری نازەنین
بۆ ناپرسی لە حاڵم

* * * *

نەخۆش و دەردەدارم دەردەکەم توولانی‌یە
عەشقی کیژێکی بوویم ماڵیان لە سەرکانی یە
نەوەڵلا ئەمن سەهوم خۆ بە ئەسڵی ئیسکانی یە
ئۆف سەلام . . . .

* * * *

با ریك و چاو داماسی کوڵمەت گولێ ڕێواسی
لە نێو دەستەی سپۆرتان دوور بە دوور ئەو کچەم ناسی
جا بۆ خۆی گازم دەکا پێم دەڵێ کورێکی خاسی
ئۆف سەلام . . . .

* * * *

خەونەکەم بۆ گێڕاوە بەڕاستی و بەبێ درۆ
بۆ وەلامی ئەو خەونە چوومە خزمەت چاو هەڵۆ
خوا کارێکی وابکا بەیەك شادبین ئەمن و تۆ
فەرموی، وەڵلاهی ئەمنیش ئەم خەونەم دیوە ئەمشۆ

ئۆف سەلام . . . .

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد

## Goranî " Selam "

Awaz / Folklor
Amadekirdin / Wirya Ehmed
Amadekirdinî helbest u
Gutinî / Ibrahim Sabîr

Pêm xoșe wek rawçiyan bimkujê yek șaçime
Em sal serî hewt Sale arezûy sêma çime
Xakî koye hîmin bê bebê ewgule bo çime
Of selam gyan selam selam leyarî na zenîn
Bo napirsî le halim

* *   * *

Nexoș û derdedarim derdekem tûlaniye
Eșqî kîjêkî bûyîm malyan leser kaniye
Ne wella emin sehum xo be eslî iskaniye
Of selam . . .

* *   * *

Barîk u çaw demmasî kulmit gulî rêwasî
Lê nêw destey sportan dûr bedûr ew kiçem nas
Ca bo xoy gazim deka pêm delê kurêkîxasî
Of selam . . .

# گۆرانی " دوگمەی سینە "

هەلبەستی نالی
ئاوازی / وریا ئەحمەد
گوتنی /جوانە مەرگ/قادر زیرەك

لە دوگمە سینە دوێنیٚ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان
لە ترسی تەلعەتت ڕۆژ هەروەکو شێت
بە ڕوو زەردی هەلات و کەوتە کێوان
دوو چاوی من کەوا سەیلی سروشکن
دە پێون ئاوی بەحری خۆی بە پێوان

** **

مەکە لۆمەی پەشێوی دلْ کە ئەمشەو
پەشێواوە لە بەر پەرچەم پەشێوان
شەڕابی لەعلی ڕوممانی لە نالی
حەرامە بیٚ مەزەی ماچیکی لێوان

** **

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری دەولێر سالْی ١٩٧٨بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .
ئەم هەلبەستەی سەرەوەم لە کتێبی " مێژووی ئەدەبی کوردی " خوالێخۆشبوو " علاءالدین سجادی
جی یەکەم،بەغد (١٩٥٢) وەرگرتووە.

# Goranî " Dugmey Sîne "

Helbestî / Nali
Awaz  Wirya Ehmed
Gutin / (Cwanemerg) Qadir Zîrek

Le dugmey sîne dwênê nwêjî şêwan

Beyanî da sifîdey baxî sêwan

Le tirsî taletit roj her wekû şêt

Be rû zerdî helat û kewte kêwan

Dû çawî min kewa seylî sroşkin

De pêwin awî behrî xwê be pêwan

* *    * *

Meke lomey peşêwî dil ke emşew

peşêwane le ber perçem peşêwawe

Serabî lalî rummanî le (Nalî)

Herame bê mezey maçêkî lêwan

# گۆرانی " بۆ کچێکی بێگانه "

هونەرەوە گۆران
ئاوازی کەریم کابان
گۆتنی/قادر کابان
ئامادەکردنی /
وریا ئەحمەد /رزگار خۆشناو

ۆر قژی زەرد سەرنجی ڕاکێشاوم
زۆر چاوی شین داویە پڕشنگ لەچاوم

** **

شان و مل و گەردنی ڕووتی بێ گەرد
سنگی نەرم و مەمکی قوتی توند وەك بەرد
ەژن و باڵای کەڵەگەت و شۆخ و شەنگ
لەش و لاری کەمێك گوشتن کەمەر تەنگ

** **

پیستی سپی بە خوێنی گەش مەیلە و ئاڵ
کوڵمی قەڵەو چەناگەی ناوەڕاست چاڵ
دەم و لێوی وەك گوڵی بەر بەیانی
ئەمانە گشت گەلێکی تریش جوانی

** **

ۆی نەشکانووم توینیەتی و ئارەزووی دڵ
هەر گەڕاوە مەلی برسیم چلاو چڵ
ە هیچ باخێك گوڵێکی سوورم دیی
بۆی چووم هەزار دڕك لە پێم چەقیبێ

---

ـە گۆرانی یە تیپی میللی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .
ـە و هەڵبەستەکەشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە( ١٦ ) دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî " Bo Kiçêkî Bêgane "

Honrawe / Goran
Awaz Kerîm Kaban
Gutin / Qadir Kaban
Amadekidirnî
Wirya Ehmed - Rizgar Xoşnaw

Zor qilî zerd serincî rakêsawim
Zor çawi şin dawye pirşing le çawim

* * * *

Şan û milû gerdinî rûtî begerd
Singî nerm û memkî qutî tund wek berd

* * * *

Bejnû balay keleget û şoxû şeng
Leşû larî kemêk goştin kemerteng

* * * *

Pêstî sipî bexwênî geş meylew al
kulmî qelew çenagey nawerast çal
Demû lêwî wek gulî ber beyanî
Emane gişt gelêkî tirîş cwanî

* * * *

Boy neşkanûm tunyetî û arezûy dil
Her gerawe melî birsîm çilaw çil
Le heç baxêk gulêkî sûrim dîbê
Boy çûm hezar dirk le pêm çeqîbê

# گۆرانی " کەژاڵ "

هەڵبەست و ئاوازی [illegible]
گوتنی حەمە جە[illegible]
ئامادەکردن
وریا ئەحمەد ئەنوەر قەرەد

کــەژاڵ هــەی قــەزات لــە خــالوانم
جیگــای هــەی شــەوت پــی ســــزانم

** **

کــەژاڵ گوڵێکــە لــە نــاو باخانــــا
شـــاگوڵی دەســـتی هـــەرزە کارانـــە
کەژاڵ . . .

** **

دوو چــاوی مەســتی شــینی ئاســـمانی
دوو ئــەبرۆی رەشــی بوونــە کـــەوانی

** **

زۆرم بــەرێ کــرد شــەوگاری نــەهات
دەرمانــە بــو مــن عــارەقی گۆنــات
کەژاڵ . . .

---

ئەم گۆرانی‌یە تیپی هونەری هەولێر بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکردووە هەر لە ساڵی ١٩٧٨دا.

# Goranî " Kejal "

Helbestû awazi / Kon
Gutinî / Hema Caza Elî
Amadekirdinî /
Wirya Ehmed - Enwer Qere

Kejal hey qezat le xalwanim
Cêgay hey şewit pê nazanim

*   *   *

Kejal gulêke le naw baxana
Şagulî destî herze kara ne
Kejal . . .

*   *   *

Dû çawî mesti şînî asmanî
Dû ebroy reşî bûne kewanî
Kejal . . .

*   *   *

Zorim berê kird şewgarî nehat
Dermane bo min areqî gonat
Kejal . . .

# مەنەلۆجی " دەبا بخوێنین "

ئاوازی / وریا ئەحمە

هەلبەست و گوتنی

سابیر عەبدولرەحمـ

دەبا بخوێنین خوشکە — خوێندن زاخاوی مێشکە
کاری خوێندن پیرۆزە — بۆ نەتەوەی ئەم هۆزە

* * * *

زانیاری چەندە خۆشە — بۆ ئەو گەلەی نە خۆشە
ئەو گەلەی بێ زانست بێ — هەردەم بێ بیرو هۆشە

* * * *

با بۆ زانین خەبات کەین — قوتابخانان بنیات کەین
هەردەم ڕوو لە زانین کەین — تا دوا ڕۆژمان دابین کەین

* * * *

گەلۆ چەرخی بیستەمە — جێی داخەو زۆر ئەستەمە
زانین وا لە حەوتەمە — لای ئێمەش هێشتا تەمە

* * * *

سەیری خۆت کە چەن قۆزی — بەژن و باڵاو بە سۆزی
من ئەڵێم دەردە داری — چونکە نەخوێندەواری

* * * *

هەڵسە بامن چارت کەم — لەم دەردە ڕزگارت کەم
ئەتبەم بۆ قوتابخانە — ناچین بۆ نەخۆشخانە

---

ئەم مەنەلۆجە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکر

# Monolojî " De be bıxwênîn "

Awazi / Wirya Ehmed
Helbest û Gorani /
Sabir Ebdulrehman

Deba bixwênîn xuşke
Xwêndin zaxawî mêşke
Karî xwêndin pîroze
Bo netewey em hoze

* *   * *

Zanyarî çende xoşe
Bo ew geley nexose
Ew geley bê zanist bê
Herdem bê bîru hoşe

* *   * *

Ba bozanîn xebat keyn
Qutab xanan binyat nêyn
Herdem rû le zanîn keyn
Ta dwa rojman dabîn key[illegible]

# گۆرانی " بەگیانی تۆ "

هەڵبەستی / خالید دلێر

ئاوازی / وریا ئەحمەد

گوتنی / سەلاح محەمەد

دڕۆیە گەر بڵێم ئاگام لە خۆیە
بەگیانی تۆ بە چاوی تۆ دڕۆیە

مەگەر هەر خۆم بڵێم چۆن هەست و هۆشم
تەریوی خۆم پەپوولەی دەوری تۆیە

ئەگەڵتا خۆم نەژیم ئەی بۆ خەیاڵم
بەلاتا بەرنەدەم ؟ دە بڵێ لە بۆیە ؟!

ـە باخی جوانی تۆدا وا لە گەشتا
هەنێ جار پەرت و ئاڵۆز هەندێ کۆیە

* * * *

هەنێ جار مەستی بادەی چاوەکانی
دەور تەنراو بە برژانگ و برۆیە

خەباڵیشم بەرامبەر چاوی مەستت
مەلۆچکەی بەردەمی بازو هەڵۆیە

قژی بۆن خۆش و نەرمت وا لە دەستیا
هەنێ پەخشانە هەندێ جار مەلۆیە

ـە چێشتن دایە دەم تامی خەیاڵی ی
مژی گۆنا تە یا نوقڵی کلۆیە ؟

---

ـە گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکرد .
- -ـنەکەشی لە دیوانی شاعیر بە ناوی ( بەرەو لووتکەی ئاوات - لاپەڕە ٩٣) دا بلاوکراوەتەوە .

## Goranî " Be gyanî to "

Helbesî / Xalid Dilêr
Awazî / Wirya Ehmed
Gutinî / Selah Mihamed

Diroye ger bilêm agam le xoye

Begyanî to be çawî to diroye

Meger her xom bilêm çon hestûhoşim

Terîwî xom pepûley dewrî xoye

Leglta xom nejîm ey bo xeyalim

Be lata ber nedem deblê le boye

## پارچە مۆسیقای دد زەنگەڵێن دد

SOLO

FIN

ساڵی (١٩٧٨) لەگەڵ هونەرمەند (سەردار ئەحمەد) بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکمان تۆمارکرد

## پارچە مۆسیقای «ئەرنەواز»

ــــئەوە سالی (١٩٧٨)هەر لەگەڵ هونەرمەندی ناوبراو بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکمان تۆمارکرد .

# گۆرانی " چارە نووس "

هونراوە / هێمن
ئاوازی / وریا ئەحمەد
گوتنی / حەمە جەزا

بەهار بوو فەسڵی زستانم
ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
درۆیە گەر گوتوویانە
بەخۆ نچێکی بەهار نایە

** **

لە بارانی مەپرسە تا هەور بگرێ بەری ڕۆژی
دەبێ بگریم هەتا ڕووی تۆ لە ژێر چارشێوی ڕەش دایە
هە ناسەم لادەدا چار شێوو ڕووبەندی ڕەشت ئاخر
هەور هەرچەندە ڕەش بێ کوا حەریفی قودرەتی بایە ؟

** **

لە ژێر سایەی برۆکەت دا حوکمرانی دەکا چاوت
لە سایەی دووخی شمشێرە کە حاکم حوکمی ئیجرایە
لە سەر بەفری بە کار نایە وەکو بیستوومە داوی ڕەش
لەسەر کوڵمەت ئەدی بۆ دڵگرە ئەو بسکە تاتایە ؟

** **

بزەت نایەتە سەر لێوو بەزەت نایێ بە حاڵم دا
ئەگەر چی زۆر لەمێژ ساڵە لە دووت دەخشێم وەکو سایە
دەزانی بۆچی من هێندە پەرێشان و خەفەت بارم
لەبازاڕی ژیان غەیری هونەر نیمە چ سەرمایە

---

ئەم گۆرانی یە تیپی هونەری هەولێر ساڵی ١٩٧٨ بۆ تەلەفزیۆنی بەغدای تۆمارکر
بروانە دیوانی " تاریك و ڕوون " لاپەڕە (١٣٣) لەوێدا نەواوی هەڵبەستەکە دەبینن

# Goranî " Çarenûs "

Honrawe / Hêmin
Awazî / Wirya Ehmed
Gutinî / Hema Ceza Elî

Behar bû feslî zistanim
Eger yarim legel ba[illegible]
Diroye ger gutûyane
Be xunçêkî behar na[illegible]

* * * *

Le baranê mepirse ta hewir bigrê berî rojê
Debê bigrîm heta rûy to le jêrçarşêwî reşdaye

* * * *

Le jêr sayey bıroketda
Hukum ranî deka ça[illegible]
Le sayey doxî şimşêre
Ke hekim hukmî icra[illegible]

## پێشەکی بەشی دووەم

...چەند سالێ بوو خولیای کۆکردنەوەی گۆرانی فۆلکلۆری لە مێشکمدا پەنگی دەخواردەوە . . . زۆر بارو دۆخی ... - ئەو کاتەوە تا ئەمرۆ- بۆ رێکەوتن ، بۆ نمونە - لە حەفتایەکاندا گەلی جار وادەبوو زۆربەی کاتم لەگەڵ ...ی گوندەکان بەسەر دەبرد و باشترین باری گونجاو بوو بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە . . . بەڵام بێ دەرامەتی ئەوسا ...گەر نەختێ کەل و پەل و ئامێری تۆمارکردن وە دەست بێنم و قۆڵی کارکردنی لێ هەڵکەم . . .

...جی سوور بوون و ووره بەرنەدان ، بوونە ووزەو پاڵپێوەنەر ئەوە بو لە (رۆژی ۱۹۷۹/۱۰/۳) ئەویش دوای رەخسانی ...حی گونجاو لە زۆر لاوە ، دەستم کردووە بەم کارە و لەو کاتە شەوە تا ئەمرۆ زۆر شارو گوندی ئەم کوردستانەم ... بە نیازی خزمەتکردنی کەلەپوور و میراتی نەتەوایەتیمان و رزگار کردنی زۆرترین ژمارە لە گۆرانی فۆلکلۆریمان ... و لەناوچوون . . ئەوەش تا ئەو رادەیەی کە لە توانای تاکە کەس دایە، تا ئێستا بە دەیان (کاسێت)م پر کردۆتەوە ...ی و مۆسیقای رەسەنمان ، هەروەها تۆمارکردنی زانیاری تەواو دەربارەی ئەو کەسانەی گۆرانیەکانم لێ ...بوون و پێ تۆمارکردوون ، لەگەڵ کات و شوێنی تۆمارکردنەکان و هتد بەلام لەمیانی کارەکەدا گۆرانی زۆر ... هەڵویستم بۆ چۆنییەتی ئەنجامدانی کارەکەدا هات . . . چونکە شتێکی بێ شکە کاری (تاکە کەس) هیچ کاتێك ...یە نە کەم و کووری و ناتەواوی . . . ئەم کارە واتە( المسح المیدانی-گەران یا خود پشکنینی مەیدانی ) ئاسان ...ی میللەتانی دی کۆمەڵێك یاخود دەزگایەکی میری دەیگرێتە ئەستۆ . . . جا ئەو کۆمەڵ و دەزگایانە هەموو شتێکی ...ت بۆ ئەو کارە و کەسانەی کەپێ‌ی هەڵدەستن وە دەست دێنن- وەك ئۆتۆمبیل و کەل و پەلی تۆمارکردنی دەنگ ...گ و پرۆگرام و پلان دادەنێن و پەیرەوی دەکەن لەکاتی کۆکردنەوەی بەرهەمە فۆلکلۆریەکان .

...حەرەش چەن دانەیەك لەو کەسانەی بەم کارە هەڵدەستن دەنێردرین بۆ دەرەوەی ووڵات بە نیازی سوود وەرگرتن ...فیکردنەوەی ئەو گەلانەو پەیاکردنی شارەزایی پتر لەم بوارەدا .

...ە نەرەخسانی ئەم هەل و مەرجانە بۆ میللەتی ئێمە لەلایەك و خۆشویستنی فۆلکلۆرو نەتەوەو نا چاریش لەلایەکی ... پالیان پێوەنام بە تاکە کەسی دەست بە کاری" گەرانی مەیدانی " بکەم، چونکە کۆکردنەوەی شتی فۆلکلۆری ...ی بێ هێشتا هەر درەنگە؟!

... بە ماوەی ئەم چەند سالەی کارکردنم لەم بوارەدا زۆر سوودم دیتووەو زۆر رێگای کورت و ئاسانترم دیوەتەوە ...حەم دانی ئەم کارە . . .

... ەشەدا کە ئەنجامی دوو (گەرانی مەیدانی)یە بۆ گوندی (سەروو چاوە) کە دەکەوێتە سەرەتای رۆژ هەلاتی دۆڵی ...ی سەربە ناوچەی‌خۆشناوەتی . . . دووەمیش بۆ شاری کەرکوك بۆ چاوپێکەوتنی ...ی کەسی دی ، کە بە رەسەن ئەوانیش هەر خەڵکی ناوچەی دۆڵی بالیسانن . . . ئەنجامی ئەم دوو گەرانەشم ئەم ... گۆرانیە فۆلکلۆری‌یەن کە لە خوارەوە هەڵبەست و نۆتەکانتان بۆ بلاو دەکەمەوە .

...ت ێرەدا پێوست بێ بگوترێ ئەوەیە - بەرەو پیل هاتن و پێشوازی کردن و روو خۆشی خەڵکی سەرتاپای ئەو گوند ...وجنەی تا ئەمرۆ بۆیان چووم باشترین هاندەر بووە بۆم و لەم بەرگەو لە بەرگەکانی دوا رۆژیشدا - گەر خوا یا ربێ ... حوم بە قەرزاری ئەوان کەسان دەزانم ئەمەش ناوو هەندێ زانیاری دەربارەی ئەو کەسە ( فۆلکلۆری)(۱) یانەی لەم ...سەد سوودم لێ وەر گرتوون .

---

... ی سوپاسی برای ئازیز کاکە (میرزا کەریم خۆشناو ) دەکەم ، کە لەم دووگەرانەدا لە گەڵم بوو و زۆریش یارمەتی ... و کارەکەی بۆ ئاسان کردم .

(۱) فۆلکلۆری - مەبەست لەو کەسەیە کە بە هەڵگری گۆرانی فۆلکلۆری دەناسرێ جا ژن بێ یا پیاو .

## " لە پردێ باسان " *

لە پردێ باسان و کاریتەی مێوە

گەیمە نازدارێ و کورِ بە بەرێو

مارم خرا بوو (١) ماندی بوو پێوە

* * * *

لە پردێ باسان و شینی بەشینی

بەینی مەمکۆڵانی شانەی هەنگوینێ

خۆزگەم بە کوڕەی کاتن دەیخوا لە خورێنی

* * * *

لە پردێ باسان و کاریتەی شکێ

یارم منداره و لێم دەگرێ ڕکێ

. . . . . .

* * * *

لە پردێ باسان و لەگەڵم نایە

هەرچەندی دەکەم و قەت خەوم نایە

دۆستی بێ بەقاو لەژوانم نایە

* * * *

لە پردێ باسان و لە گوڵی سەرکەندی

تێریان خۆلێکدا بێریان هەرقەندی

بریا ئی خۆم بای بەزاوا بەندی

* * * *

لە پردێ باسان و پێ هەرو پێدا

هێهێ کیژۆرە دەرزی لە ملێ دا

پێچکۆڵەم دێشێ قەلەمەك تێدا

---

(١) مارم خرابوو - جاریش هەیە دەگوترێ ( مارم وێران بوو ...)

* بەشیکی دی لە (پردێ باسان) لە کتێبی (فولکلور - بەرگی دووەم) لاپەرە (٥١،٥٢)دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî "Le pirdî basan"

Le pirdî basan û karîtey mêwe
Geyme nazdarê û kur be berêwe
Marim xra bû mandî bû pêwe

* *    * *

Le pirdî basan û şînî be şînî
Beunî memkolanî şaney hengwînî
Xozgem bew kurey katın deyxwa le xurênî

گۆرانی " پردی باسان "

## گۆرانی " گەردن زەرد "

هەیوان و سەیوان گەردن زەرد یار باوانم — هەیوانە بەرزە
کۆشکە و شانە شین گەردن زەرد یار باوانم — هەردوکیان تەرزە
لە بناری مەعدەن گەردن زەرد یار باوانم — ماچ کردن فەرزە

* * * *

چناری چۆمی گەردن زەرد یار باوانم — سەری لە گۆمە
یارێکم گرتووە گەردن زەرد یار باوانم — لە سنفی خۆمە

* * * *

بابچین بۆ مازوان گەردن زەرد یار باوانم — بۆ بناری کێلێ
بۆ وورە بێچوو گەردن زەرد یار باوانم — بۆ پای گێل گێلێ

* * * *

چناری چۆمی گەردن زەرد یار باوانم — سەر دە لە قێنێ
مەکری بێوە ژن گەردن زەرد یار باوانم — پیاو دە سوو تێنێ

* * * *

ئەو دەستەم ببڕن گەردن زەرد یار باوانم — ئەو دەستەم پێوە
دەس هەڵناگرم گەردن زەرد یار باوانم — لەم جووتە سێوە

* * * *

ئەو مارەم بۆ چی‌یە گەردن زەرد یار باوانم — دەیدەم بە تاران
دەیدەم بەشەدە گەردن زەرد یار باوانم — بۆ دەورەی خاران

* * * *

دەستم لێ مەدە گەردن زەرد یار باوانم — مەمکو لێنەوە
بمنێ لە باوەش گەردن زەرد یار باوانم — بملاوێنەوە

# Goranî “ Gerdin zerd ”

Heywan û seywan ( Gerdın zerd yar bawanim )
Heywane berze
Koșke u șane șîn ( Gerdın zerd yar bawanim )
Heywane berze

* * * *

Çinarî çomî ( Gerdın zerd yar bawanim )
Serî le gome
Yarêkim girwe ( Gerdın zerd yar bawanim )
Le sinfî xome

♪ = 120

(A)

ya rê ê kim gir tuwedey ger din zer ya r

ba wa a nim le sin fî xo o o me

FIN

گۆرانی " گەردن زەرد "

3/8

## گۆرانی " مارەکێ لێ نا "

مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە خۆشـــناوە
لـێ نـا مـارەکێ کـەس نـەی گـــێراوە
سەرباریان گور بوون بن باریان خـاوە
خـەرجێ ئـەو ماڵـەی هـەر لـە بۆمـن مـــاوە

* * * *

مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە بلْباســـە

ســـەرباریان گـــور بـــوون بـــن بـــا ڕێواســـە

خـەرجێ ئـەو ماڵـەی لـە بـۆ مـن بەسسـە

* * * *

مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە ئاکۆیـــە
ســـەرباریان گـــور بـــوون بـــن بـــار لیمۆیـــە
خـەرجیێ ئـەو مـارەم هـەر لـە بـۆ خۆیـە

* * * *

مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە مامەشـــــە

سـەرباریان گـوڵ بـوون بـن بـار وەنەوشـــــە

خەرجیێ ئەو مارەی هەر لە بۆ مـن باشـە

* * * *

مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە مــــەنگۆڕە
بـــن باریـــان ســـێون ســـەرباریان گـــورە

خەرجیێ ئـەو مـارەی لـە بـۆ مـن حـازرە

* * * *

زۆریـــان بـــار کـــردن شـــتڵێ ڕەیحـــانی
مـــارەکێ لـــێ نـــا مـــارە خـــەیلانی

خـەرچییێ ئـەو مـارەی بـۆ مـن دەرمـانی

# Goranî “ Marekê Lê na ”

Marekê lê na mare xoşnawe
Lê na marekê kes neygêrawe
Serbaryan gur bûn bin baryan xawe
Xercê ew maley her le bo min mawe

* *     * *

Marekê Lê na mare bilbase
Ser baryan gur bûn bin bar rêwase
Xercê ew maley le bomin besse

Moderato

(A)

ma re Ke Lê — na ca ma re bil ba — Se ey Ser bar yan

gul bûn — bin bar rê Wa Se

D.C

گۆرانی " مارەکێ لێ نا "

ڕەگەزی (٤) ڕەنگی (بەیات) لە سەر (SOL)

(ڕەزم)

# گۆرانیی " لێ نێن "

لێنێن لێنێن وان باران | ماران هەر هاتەو هاتە
بەژنی باریك ڕاڕۆیی | دەڵێی قۆنگرەو قەلاتە
وەی گوتمی بێنەو ماچت کەم | لێت چۆڵ کردم ووراتە(١)

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | مار گەینە گۆڕی سایی(٢)
بەژنی باریك ڕاڕۆیی | لە سەر چەورەو بیزایی
گوتمی بێنەو ماچت کەم | شوانان مەڕ بەردایی

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | مارگەینە بەر بەردایی
بەژنی باریك ڕاڕۆیی | بە لیفکان دەکا تۆزی
گوتمی بێنەو ماچت کەم | ژیکەلێ قیت و قۆزی

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | مارگەینە پشت بێخاری
بەژنێ باریك هات ڕۆیی | حدودێ گەورە ماری
گوتمی بێنەو ماچت کەم | قەدم لە قەدت ئاری

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | مار گەینە لای کاژۆستی
بەژنی باریك ڕاڕۆیی | نەرم و نۆڵە و بە چوستی
گوتمی بێنەو ماچت کەم | مەمکت خڕ بوون بۆ دەستی

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | مار دەچوون گەروو گەروو
بەژنێ باریك ڕاڕۆیی | وەی لێی بەجێمان گەدە روو(٣)
گوتمی بێنەو ماچت کەم | حدوودێ جا نوەك لە دوو

* * * *

لێنێن لێنێن وان باران | پایزە و خێڵ بەرەو ژێرە
بەژنێ باریك ڕاڕۆیی | دەڵێی شتڵە شلێرە
گوتمی بێنەو ماچت کەم | گوناح نیەو زۆر خێرە

(١) ووراتە واتە وڵاتە - هەندێ جاریش دەگوترێ( لێت چۆڵ کردم بێتواتە). (٢)(گۆڕی سایی،ئەنگۆزێ،بێخارێ،گاژۆستی)هەمووی ناوی ناوچەو شوێنن لە بێتواتە. (٣) گەدەروو - واتە ملوانە .

# Goranî “ Lênên ”

Lênên Lênên wan baran
maran her hatew hate
Bejnê barîk raroyî
delêy qongrew u qelate

* * * *

Lênên Lênên wan baran
payze û xêl berew jêre
Bajnê barîk raroyî
delêy şitle Şilêre

گۆرانـــی " لـــێ نێـــن "

# گۆرانی " هاتەوە "

هاتەوە تەیری گەرمێنێ   بەوی دەڵێن باشووکە
سەرباریی خۆی هەڵگرتن   لە بۆ هەورێ دەچووکە
گوتمێ بێنەو ماچت کەم   ژیکەلەی تۆ وەرە ئەورۆکە

* * * *

هاتەوە تەیری گەرمێنێ   بەوی دەرێن هەر قازە(۲)
سەرباریێ خۆی هەرگرتن   فەرخەی بوون پەرەوازە
گوتمێ بێنەو ماچت کەم   گەردەنم بکە و ئازە

* * * *

هاتەوە تەیری گەرمێنێ   بەوی دەڵێن مراوی
سەرباریێ خۆی هەرگرتن   لە بۆ بن هەورو ساوی
گوتمێ بێنەو ماچت کەم   ژیکەلێ خۆی لە بۆمن داوی

* * * *

هاتەوە تەیری گەرمێنێ   بەوی دەڵێن شەهێنە
سەرباریێ خۆی شۆڕکردن   لە ترسی خەرجە ستێنە
گوتمێ بێنەو ماچت کەم   ژیکەلێ چاوان هەڵهێنە

* * * *

(۲)ئەم بەیتە یان هەندێ جار وەك خوارەوە دەگوترێ :

هاتەوە تەیرۆکەی گەرمێنێ دەنا وەی بەویش دەڵێن هەربازە سەرباری دەخۆی لێکدەدان و دەنا لە بۆ ئاسمانەی هەورازە پێم گۆت بێنەو ڕاتکوشم دەنا فەرخۆڵەی کردن پەروازە.

ئەم هەڵبەستە لە کتێبی (فۆلکلۆری هونراوەی کوردەواری) لاپەڕە(۱٥۸)دا هەروەها لە کتێبی "داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردی دا لاپەڕە(۱۱۲) " دا بلاّوکراوەتەوە.

# Goranî " Hatewe "

Hatewe teyrî germênê

Bewî delên basuke

Ser barêy xoy helgirtin

Le bo hewrê de çûke

* * * *

Hatewe teyrî germênê

Bewey derên her qaze

Ser barêy xoy hergirtin

Ferxey bûn perewaze

Andante

ha te- we- tey ro ney- ger- mê- nê- de na ey be wî - de ye rên n ba- sû ke

D.C.

گۆرانـــی " هاتـــەوە "

## پێشەکی بەشی سێیەم

ئەم بەشە بریتی‌یە لە چەند گۆرانی‌یەکی فۆلکلۆری کاتی خۆی واتە لە ١٩٨٠/٢/٢٧ لە لایەن مامۆستا "سەدرەدین خۆشناو "ە وە کۆ کراونەتەوە، ئەو کاتەی ناوبراو مامۆستا بووە لە گوندی "جەرە " ی سەر بە ناحییەی "سیدەکان"ناوچەی برادۆست.

کارەکەی مامۆستا خۆشناو بایەخدارە چونکە جگە لە نووسینەوەی هەڵبەستی گۆرانییەکان، هەستاوە بە تۆمارکردنی ئاوازی گۆرانیەکانیش بەدەنگی دێهاتیەکان لەسەر کاسێت، ئەوە بوو کاتی خۆی چەند دانەیەك لەو گۆرانییانەم ئامادەکردو تۆمارکرد بۆ تەلەفزیۆن - ئەو کاتەی سەرپەرشتی تیپی خانزادم دەکرد ئەوەی لێرەدا پێویستە دووبارەو سێبارەی بکەمەوە ئەوەیە خۆزگە نموونەی مامۆستا خۆشناو زۆر دەبوون (١).

ئێستاش وا لە خوارەوە نۆتەو هەڵبەستی هەندێك لەو گۆرانیانەتان پێشکەش دەکەین .

گۆرانیەکانی ئەم بەشە لە لایەن :
"عەزیز ڕەشید ئاودەل"ەوە دەگوترێن و "مەجید حەسەن و حەسیب حوسێن"یش بۆی دەگێڕنەوە.



(١) بروانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە(٩٥)لاپەڕە (١٠٢)بۆ زیاتر ئاگادار بوون لەم مەسەلەیەی کۆ کردنەوەی گۆرانی فۆلکلۆری.

# گۆرانی " جەللە بۆ "

## بۆشایی "چوغ جانوو" دەگوترێ (١)

هات جەللە بۆ جەللەبو
یەك مالّی من جەللەبە
هەو شەۆ مەچە لێرە بە
یەك مالّی من جەللەبە
مێوانی زەریا خۆبە
یەك مالّی من جەللەبە
هات جەللەبێ بزنە
یەك مالّی من جەللەبە
من چەران تەڕاز نە
یەك مالّی من جەللەبە
بۆ خاترێ دەست بازنە
یەك مالّی من جەللەبە
هات جەللەبێ بەرانە
یەك مالّی من جەللەبە
من چەران لە زۆزانە
هات مالّی من جەللەبە
بۆ خاترێ کچا جوانە
هات مالّی من جەللەبە
هات جەللەبێ بەردیلە
یەك مالّی من جەللەبە
من ئاودا ل بنێ بیرە
یەك مالّی من جەللەبە
بۆ خاترێ کچێ میرە
یەك مالێ من جەللەبە

ئەم گۆرانی‌یە بۆ شایی‌یەك دەگوترێ پیّی دەڵێن "چوغ جانوو" ، ئەم شایی‌یە وەك شایی شێخانی‌یە بەڵام ئەمەیان پیّیەك لە بۆ پێشەوە دەچی و پیّیەکیش بۆ دواوە. -سەدرەدین خۆشناو -

# Goranî " Celebo "

Hat cellebo celebo
Yekmalê min cellebe
Hew şo meçe lêre be
Yek malê min cellebe

* * * *

Hat cellebê bizne
Yekmalê min cellebe
Min çeran terazne
Yek malê min cellebe




گۆرانـی " جەللـە بـــۆ "



## گۆرانى " كانى و بەركانى "

### بۆشايى شێخانى دەگوترى

كـــانى و بـــەركانى لێلـــێ
كـــانى ل نـــاڤ ڕەزى
چ ڕێى لـــێ نـــاچن لێلـــێ
هـەر ل بـەر كـەر گـەوزى
هەوشـــە و تالاّنـــە لێلـــێ
بســـكێ ســۆر مـــەرەزى
كـــانى و بـــەركانى لێلـــێ
هـــۆ كـــانيێ لـــە دۆلّـــێ
چ ڕێى لـــێ نـــاچن لێلـــێ
هـــەر ل بـــەر كـــەركۆلێ
هەوشـــە و تالاّنـــە لێلـــێ
جـــا بســـكێ كيژۆلـــێ
كـــانى و بـــەركانى لێلـــێ
هـــۆ كـــانيى تـــە چيـــايى
چ ڕێى لـــى نـــاچن لێلـــى
جـــا لەبـــەر گيـــايى
هەوشـــە و تالاّنـــە لێلـــى
جـــا بســـكێ بـــادايى
كـــانى و بـــەركانى لێلـــێ
وەى كـــانيى بـــە رۆكـــێ
چ ڕێى لـــێ نـــاچن لێلـــێ
وەى لەبـــەر مـــەندۆكێ
هەوشـــە و تالاّنـــە لێلـــێ
جـــا بســـكێ كيژۆكـــێ
كـــانى و بـــەركانى لێلـــێ
كانيـــا نـــاو بيشـــى
چ ڕێى لـــێ نـــاچن لێلـــێ
هـــەر ل بـــەر قاميشـــێ
هەوشـــە و تالاّنـــە لێلـــێ
جـــ بســـكى ئەموشـــى

# Goranî " Kanî û ber Kanî "

Kanî li nav rezî
ÇI rêy lê naçin lê lê
Her liber ker gewizî

* * * *

Kanî u berkanî lê lê
Wey kanî berokê
Çi rêy lê naçin lê lê
Wey le ber mendo kê

Moderato

(A)

Ka- niu ber ka- niu ber ka- nî le do rê

گۆرانی " کانی و بەکانی "

میانی (٣) دەنگی

## گۆرانی " خەجۆ "

**بۆ شایی ڕۆیین و دووپێیی دەگوترێ**

چۆمە ئەستەمبۆڵە ڕەنگینە

ئۆف خەجۆ دڵێ من

کوڕێت وان چ خوندینە

ئۆف خەجۆ دڵێ من

کچێت وان سۆرو سپینە

ئۆف خەجۆ دڵێ من

دڵێ من پڕ برینە

ئۆف خەجۆ دڵێ من

دەرمانی دڵم بینە

جان خەجۆ دڵێ من

مەرحەمێ سەر دادنیە

جان خەجۆ دڵێ من

ئەم گۆرانییە لە بەشی یەکەمی (کتێبی فۆلکلۆر) بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî “ Xeco ”

Çûme estembole rengîne
Of xeco dilê min
Kurêt wan çI xundîne
Of xeco dilê min

* * * *

Kiçê wan soru spîne
Dilê min pir birîne
Of xeco dilê min




گۆرانـــی " خــــەجۆ "



# گۆرانی " عایشۆکێ "

## بۆ شایێ شێخانێ دەگوترێ

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

دێ بـــلا وەبـــی هـــەروەبی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

دەستێ مـن پـاخلا تـــــەبی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

دە بخـــێرا بـــابێ تـــــەبی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

هەل کەنگی و هەتا کەنگی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

مـــەمك سـێوە فـــەڕەنگی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

چ خـــڕن ناچنـــە چـــەنگی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

مـەمك سێوا سـەر لکـــــی

١

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

دێ خراب کە ب نەینۆکی

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

مـــەمك سـێوێ نـــاو ڕەزا

عەیشـــــۆکێ دەلالـــــێ

دێ خراپ کـەن ل بـەگازا

گۆرانی‌یە "تیپی خانزادی کچان"ی هەولێر ساڵی ١٩٨٣ بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوکی تۆمارکرد .

# Goranî " Ayşokê "

Eyşokê delalê
Dê bila webî herwebî
Eyşokê delalê
Destê min paxla te bî

* *  * *

Eyşokê delalê
Hel kengî u heta kengî
Eyşokê delalê
Memik sêwa Ferengî

Moderato

(A)

D.C.






## گۆرانی " وەز تازەمە "

**بۆ شایی شێخانی دەگوترێ**

وەز تازەمە تازەمە
عەلی یۆ لاوۆ تازمە
برنۆ ڕەقەم حەڤدەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
دەسمالا چار گۆشەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
گۆش لە گۆشێ زێرەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
عەینۆ خۆ دە چاردەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
وەز تازەمە تازەمە
عەلی یۆ لاوۆ تازمە
ئەز مێرەکی سەد مێرەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
گولیکا ناو باخچەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
بەختێ تەو بابێ تەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
ئەز دەسمالا سەر دەستەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
ئەز بچووکم هەندەمە      عەلی یۆ لاوۆ تازمە
وەز تازەمە تازەمە
عەلی یۆ لاوۆ تازمە

ئەم گورانی‌یە "تیپی خانزادی کچان"ی هەولیر سالی ١٩٨٣ بو تەلەفزیونی کەرکوکی تومارکرد .

# Goranî " Wez tazeme "

Wez tazeme tazeme

Elıo lawo tazeme

Birno reqem hevdeme

(Elîyo lawo tazeme)

Desmala çar goşeme

(Elîyo lawo tazeme)

Goş le goşê zêreme

(Elîyo lawo tazeme)

Eyno xo de çardeme

(Elîyo lawo tazeme)




گۆرانـی " وەز تازەمـە "



## گۆرانی " نەورۆز " (١)

**بۆ شایی سەیی دەگوترێ**

نەورۆز نەورۆز نەورۆز
هات عەیدا نەورۆزێ

نەورۆز هات زستانە چووە عەیدا نەورۆزێ
ئاوا دیس ئیرانە هات عەیدا نەورۆزێ
مەسکەنین تەهرانە بێت عەیدا نەورۆزێ
نەورۆز هات پایزا چووە عەیدا نەورۆزێ
گوڵدان پەلکێت گویزا هات عەیدا نەورۆزێ
خەو خۆشە دگەل قیزا هات عەیدا نەورۆزێ
نەورۆز هات بەهارە هات عەیدا نەورۆزێ
گوڵدان پەلکێت دارە چووە عەیدا نەورۆزێ
خەو خۆشە دگەل یارە هات عەیدا نەورۆزێ
نەورۆز هات نیسانە کا عەیدا نەورۆزێ
داران گولیلک دانە بێت عەیدا نەورۆزێ
کوڕ عاشقێ چاوانە کا عەیدا نەورۆزێ
لاو عاشقێ چاوانە کا عەیدا نەورۆزێ

ئەم گۆرانییە لە لایەن مامۆستا "سەدرەدین خۆشناو"ەوە لەکتێبی "فۆلکلۆر"بەشی یەکەم دا بلاوکراوەتەوە.

# Goranî “ Newroz ”

Newroz Newroz Newroz
Hat eyda Newrozê

Newroz hat zistane
Çuwe eyda Newrozê
Awa dis irane
Hat eyda Newrozê
Meskenên Tehrane
Bêt eyda Newrozê

Newroz hat payıza
Çuwe eyda Newrozê
Gul dan pelkêt gwiza
Hat eyda Newrozê
Xew Xoșe dı gel gîza
Hat eyda Newrozê

* *   * *

Modrato
(A)
new roz new roz new roz hat ey da- new- ro zê new roz new roz
new roz hat ey- da new- ro zê

گۆرانی " نەورۆز "

(Ri)

# گۆرانی " هۆب زەندان "

**بۆشایێ شێخانێ دەگوترێ**

هۆب زەندان و هۆب زەندان      هۆب زەندان بازی و بەندان

پیرۆز بی خەنە و بەندان      هۆب زەندان و هۆب زەندان

هۆب زەندانێ هۆب زەندان      هۆب زەندانێ بازنێ سۆر

بازنێ یارێ گران تێنۆ      هۆب زەندانێ بازنێ زەر

چەند زێرێ لە حوکمە تێنۆ      هۆب زەندانێ و بازی و بەندان

بگرن ملێت گۆوەندان      پیرۆز بی خەنەو بەندان

بازنا دۆستا من شکابی      پیرۆز بی خەنەو بەندان

حەق بەزەندێ یارێنە      هۆب زەندان بازی و بەندان

من برد سەر هۆستایی      هۆب زەندان بازی و بەندان

قاشیەك ئەلْماس لێ دایی      هۆب زەندان و هۆب زەندان

رەحمەت بابێ هۆستایی      هۆب زەندان بازی و بەندان

هۆب زەریۆکا تە خوبی      هۆب زەندان بازی و بەندان

تو ئەستێرا سەر مەغلووبی      هۆب زەندان بازی و بەندان

تو خانی تو مەحبووبی      هۆب زەندان بازی و بەندان

هۆب زەریۆکا گول گولی      هۆب زەندان بازی و بەندان

کەسك و سۆر و خەملی      هۆب زەندان بازی و بەندان

کەزیێ تە وێ ل سەر ملی      هۆب زەندان بازی و بەندان

بازنێ زەندا جۆتن      بیخنە گەرێ گۆوەندان

هەل سەر هەنیا داگوتن      هۆب زەندان بازی و بەندان

بازنێ زەندێ سێنە      هۆب زەندان بازی و بەندان

هەب سەر هەنیا دا تێنە      بیخنە گەرێ گۆوەندان

هۆب زەندان و هۆب زەندان      پیرۆز بی خەنەو بەندان

بازنێ زەندێ چارن      هۆب زەندان بازی و بەندان

هەب سەر هەنیێ دادبارن      پیرۆز بی خەنەو بەندان

ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارەی (٣)ی سالی حەوتەم ١٩٨٣ دا بلاوکراوەتەوە.
هەمان سالْ "تیپی خانزادی کچان" تۆماری کردووە بو تەلەفزیونی کەرکوك.

# Goranî “ Hob Zendan ”

Hob zendan u hob zendan

Hob zendan bazî bendan

Pîroz bî xeneu bendan

Hob zendan bazî bendan

Hob zendan ê hob zendan

Hob zendanê baznê sor

Baznê yarê grantêno

Hob zendanê baznê zer




گۆرانی " هۆب زەندان "





## گۆرانی " لێ ڕحانێ "

لێ ڕحانێ لێ لێ ڕحـــانێ     زەرپــێ مێوانــێ تەمـــە
لـــێ ڕحانۆکـــە کۆتـــەلێ     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
پەرچـــەمی دانـــە خـــەنێ     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
لێ ڕحانێ لێ لێ ڕحـــانێ     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
بـــابت بـــەمیری کـــەلێ     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
لێ ڕحانێ لێ لێ ڕحـــانێ     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
لـــێ ڕحانۆکـــە زوومـــەزرا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
پەرچـــەمی لـــە گـــولاڕەزا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
بـــابت بـــە مـــیری زەرزا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە

لێ ڕحانێ لێ لێ ڕحانێ . . . .

لـــێ ڕحانۆکـــە داراشـــا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
بـــابت بـــەمیرو پاشـــا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە
بـــابت بـــەمیرو پاشـــا     زەریــێ مێوانــێ تەمـــە

لێ ڕحانێ لێ لـــێ . . . .

# Goramî " Lê rihnê "

Lê rihanê Lê Lê rihnê

(Zeryê mêwanê teme )

Lê rihanê kotelê

(Zeryê mêwanê teme )

Perçemî dane xemê

(Zeryê mêwanê teme )

Lê rihanê Lê Lê rihanê

(Zeryê mêwanê teme )

Babit be mîrî kelê

(Zeryê mêwanê teme )

♩=104 (A) D.C.

Lêri ha nê Lê Lêri ha nê zer yê mê Wa nê tem me

گۆرانـی " لـێ رحـانێ "

(ڕەزم)

# سەرەتای بەشی چوارەم

لەم بەشەیان سوودم لە پەرتووکەکەی مامۆستای گۆرانی بێژ " تایەر تۆفیق " بە ناوی " گوڵی سەربەستی "(١) وەرگرتووە، نابێ نکوڵی لە وە بکرێ کە گۆرانی بێژە ڕەسەنەکانمان زۆرەها گۆرانی فۆلکلۆرییان بەدەنگە خۆش و کاریگەرەکانیان بۆ ئێمە تۆمارکردووەو کارەکەیان مایەی شانازی‌یە چونکە بووەتە هۆی ڕزگار کردنیان لە فەوتان و لە ناوچوون، وا لە خوارەوە چەن دانەیەك لە نۆتەو هەڵبەستی ئەو گۆرانیانەتان بۆ تۆمار دەکەین، ئەوەی شایانی باسیشە نۆتەی دوو گۆرانی لەم گۆرانی‌یانەم(٢) لە پەرتووکەکەی هونەرمەندی مۆسیقازانی عێراقی مامۆستا " جەمیل بەشیر - العود و طريقة تدريسه/الجزء الثانی " وەرگرتووە، هونەرمەندی ناوبراو لەو پەرتووکەدا زیاتر لە (٣٠) سی گۆرانی کۆن و تازەی کوردی کردووە بە نۆتە ، هەرچەندە بەڕای من کارەکەی مامۆستای ناوبراو لە دوو لایەنەوە بە ناتەواو دێتە بەرچاو ؟! یەکەمیان زۆر بەچاکی و بە ووردی و لەسەرەخۆ نەچۆتە ناو ناخ و قوولایی ئاوازەکان . . . دووەمیشیان ئەو نۆتانەش کە بلاوی کردوونەتەوە بەبێ هەڵبەستن . . . بەلام من لێرەدا هەڵبەستەکانم بە بێ کەم و کووڕی لە گەڵدا بلاوکردوونەتەوە .



(١) کتێبی " گوڵی سەربەستی " لاپەڕە ١٧١ بەشی - لە گوڵزاری شیعری فۆلکلۆری کوردی یەوە .
(٢) گۆرانی " ئامینێم نازەنینی - وەك قومری سەربالم شینە " .

# گۆرانی " کەتانە کەتانە "

کەتانە کەتانە باوانم عەمرم کەتانە

بێنە ماچت کەم باوانم خاڵ دانە دانە

قەتاریٚ بێنن خەمانم بارکەن

لە نزیك شاری یار خەبەردارم کەن

داری پیرەدار کەی بەدار بووە

دۆستی دوور وولات کەی بەیار بووە

هەی داد هەی بێداد کوا ئاوەدانی

قەبرم هەڵکەنن لە رێگای کانی

ئەگەر نەم دەیتیٚ دووماچ بە جاریٚ

دوو براکەت بمریٚ هەریەك لە شاریٚ

نەگەنجم دەویٚ نە مالچی دنیا

باڵای تۆم دەویٚ بە تاقی تەنیا

شەرت و بیٚ شەرتیت وا وادەی داوە

ئاخۆ بنیاتت لە کویٚ داناوە

هەی داد هەی بیٚداد خۆ من نەماوم

وەك جۆگەلەی ئاو خوێن دیٚ لە چاوم

ئەم گۆرانییە لە کتێبەکەی " گوڵی سەربەستی " لاپەرە ١٧٩ دا بلاْوکراوەتەوە .

# Goranî "Ketan Ketane"

Ketan Ketane bawanim Emrim Ketane

Bêne maçit kem bawanim xal dane dane

Qetarê bênin xemanim barken

Le nzik şarî yar xeber dar ken

Dri pire dar key bedar buwe

Dostî dür wilat key be yar buwe

Andante

(A)

Ket tan ke ta— ne— ba— wa— nim em rim ke ta — ne

bê ne ma çit kem ba wa nim xal da ne da — ne ke ta — ne

em rim— ke— ta — ne

D.C.

گۆرانی " کەتانە کەتانە "

(ڕەزم ٢)

(مەسموودی گچکە)

ڕەگەزی مەقامی (عەجەم) لە سەر (SOL)

ڕەگەزی (٥) دەنگی

# گۆرانی " گەردوون من چی بکەم "

گەردوون من چی بکەم چیم دەستەلاتە
خـــەتای مـــن نیـــە دڵ موبتەلاتـــە
رووحـــی شـــیرینم دەورەی باڵاتـــە
رووتـــم نـــەدیوە عەشـــقی بـــاڵاتم
ئەوا تـۆ ئـەڕۆی مـن جێگـەم کـوێ بـێ
لـە کـێ بفکـرم شێوەی لـە تۆ بـــێ
ئـەوا مـن ئـەڕۆم بـۆ وولاتەکـەی خـۆم
پرسـێکت پێ‌بکـەم بـڕۆم یـا نـــەڕۆم
نـە گـەنجم دەوێ نـە مـاڵی دونیـــا
بـاڵای تـۆم دەوێ بـە تـاقی تـــەنیا
هـــەردەم دەنـــاڵم لـــە بـــەر برینـــم
دەردم دەواکـــە ناڵـــە خوێنینـــــم
مـــن دوورو تـــۆ دوور بـــەینێ ببەستین
بـە فرمێسـکی چـاو جۆگـە هەڵبەسـتین

ئەم گۆرانی‌یە لە کتێبی " گوڵی سەربەستی " لاپەرە (١٨٠) دا بلاوکراوەتەوە .

# Goranî :“ Gerdûn min çibkem “

Gerdûn min çibkem çim deselate
Xetay min niye dil mubtelate
Rûhi şîrînim dewrey balate

Eba ketan çîn mero ledwatim
Rûtim nediwe eşki balatim

Ne gencim dewê ne mali dûnya
Balay tom dewê be taqi tenya

گۆرانی " گەردوون من چی بکەم "

# گۆرانیی " هێند بڵندەو هێند قۆزە "

هێند بڵندەو هێند قۆزە     هەوری لەملان ئاڵۆ
لە بەر دایکی ناوێرم     لێی کەم جەژنە پیرۆ
دوو بە دوو کچێ دوو بە دوو     ئاورم لە جەرگی بەرب
توخوا بێنە ماچت کەم     موسڵمانم نابمە جـ
قەدی دەڵێی نەمامە     مەمکی هەروەك شەم
ئەوە حەوت ساڵە شێتم     من هەروا بە تەمامـ
شەوو ڕۆژ لە گریانم     خوێن دێ وا لە چاو
شۆخێ ڕەحمەت بێتە دڵ     بۆ ناڵە و بۆ گریـ
بە ژن و باڵا لاولاوە     زولف و ئەگریجەی خـ
من ماچ کەم ئەم لێوانە     ڕزگار دەبم لەم دە

ئەم گۆرانی‌یە لە کتێبی " گوڵی سەربەستی " لاپەڕە (١٨٤) دا بڵاوکراوەتەوە .

## Goranî " Hênd bilind û hênd qoze"

Hênd bilide u hênd qoze
Hewri le milan aloze
Le ber dayki nawêrim
Lêy kem cejne piroze

Qedi delêy nemame
Memki her wek semame
Ewe hewit sale sêtim
Min her wa be temame

(A)

hên bi Lin dû hên qo ze hew rî lem- Lan- a- Lo ze

hên bi Lin dû hên qo ze hew rî Lem- Lan- a- Lo- ze (B) Le

ber day kî na- Wê- rim e rê so re jin e rê

rû be Xal Lêy kem Cej- ne- pî- ro- ze Le ber day kî

na- Wê rim e rê so - re jin e rê rû be Xal

Lêy kem Cej ne- pî ro ze

D.C.

گۆرانی " هێند بلندەو هێند قوزە "

مەقامی (عەجەم) لە سەر (SOL)

$\frac{2}{4}$ (ڕەزم)

# گۆرانی " چارۆگێ "

چارۆگی و چارۆگێ   دەبا بێ خودانی چارۆگێ

چارۆگێ و چارۆگێ   دەبا بێ شلکە گرێ لە دەسرۆکی

چارۆگەی سپی‌یە   بردم بۆ خمی یە

دوو قڕانی ویستی‌یە   شۆڕم ڕازی نی‌یە

یارم دەڕوا دێتن   دڵ دەباو دەچێتن

سوخمەی گەلێ سوورە   لە مەمکۆڵەی دێتن

یارم چەندە جوانە   دەڕوا بە ڕێگاوە

مردم چیم لە خۆم کرد   شۆڕێم لێ تۆراوە

یارم بە چاو بازە   گەردەن دەڵێی قازە

بە لەنجە دەڕواتن   چەند بەعیشوەو نازە

چارۆگێ و چارۆگێ

ئەم گۆرانی‌یە لە کتێبەکەی " گوڵی سەربەستی " لاپەڕە(١٨٩) بلاّوکراوەتەوە .

## Goranî " Çarogê "

Çarogê çarogê deba bê xudani çarogê

Çarogê çarogê deba bê silke girê le desrokê

Çarogê sipiye bir dim bo ximiye

Dû qiranî wîstıye şorim razi niye

Yarim be çaw baza
Gerdin delêy qaze
Be lence derwatin
Çend be îşwe u naze

گۆرانـی " چـارۆگێ "

## گۆرانی " ساقی دەروێشان "

ساقی دەروێشان جامێ شەڕاب بابێ
پڕکە پیاڵە ماچ لە گۆشەی چاوبێ
ئەو کچە نازدارە بۆ چ لێمان تۆریاوبێ
لە بەندی چارۆگێ یەکە یەکە وای کە
دەوەرە تەماشای کە
هەستە بێرە لام قەت مەچۆرەوە
خەمی سەد ساڵیم لەبیر بەرەوە
هەستە بێرە لام لە جێی گشت کەسم
تۆی هێزی ئەژنۆم دار عەسای دەستم
ئەم چاوە جوانە خوا بە تۆی داوە
مەینەتی دنیا هەر بۆ من ماوە
ئەمشەو بەبێی تۆ چەند پەرێشانم
چاوەڕێی تۆمە نووری چاوانم
ئەو بالا بەرزەت لەحەد دەرچووە
وەك داری لیمۆ جووت ناری گرتووە

ئەم گۆرانییە لە کتێبەکەی " گوڵی سەربەستی " لاپەرە( ١٩٢) دا بلاوکراوەتەوە .

## Goranî “ Saqi Derwêşan”

Saqi derwêşan camî şerab ba bê

pirke piyale maç le goşey çaw bê

Ew kiçe nazdare boçı lêman toryaw bê

Le bendî çarogê yeke yeke way yeke

Dewere temaşay ke

Heste bêre lam le cêy gişt kesim

Toy hêzi Ejnom dar esay destim

گۆرانی " ساقی دەروێشان "

# گۆرانی " هەرمێ وەی وەی هەرمێ "

هەرمێ وەی وەی هەرمێ — سینگۆڵەت باخی ورمێ
جووت شەمامەی سەر سینەت — ناوێرم دەستیان بەرمێ
خەڵکانم زۆر لێ دیارە بۆیە — لێی دەکەم شەرمێ

* * * *

هاتووە لەلای ورمێیە — باری خۆخ و هەرمێیە
هەرمێ یەکەی بۆ من بێ — جاخۆخەکەی بۆ کێیە ؟
دەچمە وولاتی گەرمێنێ — لێم زیزەو نام دوێنێ
شێخی گەرمێن و کوێستان — خوایە لە منی نەستێنێ
هاتووە لەلای ئالانێ — کەروێشکی گەرمەلانێ
دە کچێ بێنە ماچت کەم — بە سەد لیرەی هەرزانێ
هاتووە لەلای ئەندێزێ — تاقڕانیان دەکا ڕێزێ
لەبەر خاتری یارەکەم — ئاوەدان بێ کارێزێ

ئەم گۆرانییە لە کتێبەکەی " گوڵی سەربەستی " لاپەڕە(٢٠٢) بڵاوکراوەتەوە .

## Goranî “ Hermê Wey Wey Hermê ”

Hermê wey wey hermê
Singolet baxi wirmê
Cûtê ṣemamey ser singit
Nawêrim dastyan bermê
Xelkanim zor lê dyare boye
lêy dekem ṣermê

* *  * *

Hatwe lelay wirmê ye
Bari xox û hermêye
Hermêyekey bomin bê
Ca xoxekey bo kêye

گۆرانی " هەرمی وەی وەی هەرمی "

## گۆرانیی " چیبکەم جەرگە سووتاوە "

چیبکـەم جەرگـە سـووتاوە گیانـە

چونکـــە یـــار لێـــم تـــۆراوە

عـەقل و هۆشـم نـەماوە وەی وەی

خـــواردن و خـــەوم خوێنـــاوە

* * * *

ماڵمـان ئەوبـەر ئـەو بـەرە گیانـــە

کـێ منـی کوشـت ئـەو دولبـەرە

بـەدەم جوێنـم پـێ دەدا چـاوڕەش

بـــە چـــاو پێـــم دەڵـــێ وەرە

* * * *

سـێو پێگـەیی نـەهاتی چاوکـــاڵ

کـــە لیمـــۆ زەرد بـــوو وەرە

نـەخۆش کـەوتم نـەهاتی وەڵـــلا

وادەی روح کێشـــــــان وەرە

* * * *

سـەیران مـانگی نیسـانە گیانـــە

چونکـــــە وادەی گوڵانـــــە

نازی گوڵ و گوڵ خونچە شۆڕێ

چریکـــــەی بولبولانـــــە

هەروەها لە کتێبی ناو براو لاپەڕە (٢٠٤) دا بڵاوکراوەتەوە .

Goranî “ Çîbke Cergim Sûtawe ”

Çîbkem cergım sûtawe / gyane
Çunke yar lêm torawe /weywey
Xwardin û xewim xwênawe

Malman ewber ew bere / gyane
Kê minî kuşe ew dilbere
Be dem cwênim pê deda / çaw reş
Be çaw pêm delê were

گۆرانی " چیبکەم جەرگە سووتاوە "

میانە، دەنگی دبەیات، لەسەر (لا)



## گۆرانی " کراس زەردی "

کــراس زەردێ کــراس زەردێ

کــراس زەردێــم لــێ تــۆراوە

کراس زەردێم بۆ بکەن بە بووك

بیبــەن بــۆ بــاخی شــــەقلاوە

* *   * *

بــە تــۆ دەڵێــم چــاو ئەســتێرە

خزمـــەتێکمان پــێ بســـــپێرە

هــەر ئەمشــەومان مــاوە لــێرە

کـــــــــراس زەردێ . . .

* *   * *

بــە تــۆ دەڵێــم چــاوی چــاوم

لــە ســەر تــۆ چــەندیان لــێ داوم

لــە مــن وایــە خــەڵات کـــــراوم

کــراس زەردێ . . .

* *   * *

ئەم گۆرانی‌یەش هەر لە کتێبی ناو براو لاپەرە (٢٠٥) دا بلاوکراوەتەوە .

## Goranî " Kiras Zerdê "

Kiras zerdê Kiras zerdê
Kiras zerdêm lê torawe
Kiras zerdêm bo biken be bûk
Bîben bo baxî şeqlawe

* *  * *

Be to delêm çaw estêre
Her em şewman mawe lêre
Kiras zerdê . . . Kiras zerdê
Kiras zerdê . . .

گۆرانی " کراس زەردێ "

## گۆرانی " وەك قومری "

وەك قومـــری ســـەربالْم شـــینە
کـــارو پیشـــەم هـــەر گریینـــە
ئەســـمەران خوێنیـــان شـــیرینە
وەی وەی وەی وەی بارانـــــە

* * * *

چـــاوی ڕەشـــت بـــە خومـــارەوە
مـــەمکت ســـێوە بـــە دارەوە
خـــوا پـــێی داوی مـــەی شـــارەوە
وەی وەی وەی وەی بارانـــــە

* * * *

چوومـــە ماڵیـــان بـــە میوانـــی
پەنجـــەم گوشـــی لەگـــەڵ ڕانـــی
دایکـــی عـــەییار زوو پـــێی زانـــی
وەی وەی وەی وەی بارانـــــە

* * * *

خزمینـــە خۆتـــان و خواتـــان
ئەگـــەر چـــاو ڕەش هاتـــە لاتـــان
قـــەدری بگـــرن بەســـەر چاوتـــان
وەی وەی وەی وەی بارانـــــە

* * * *

خزمینـــە جـــەرگم کـــون کونـــە
ئـــەو عالەمـــەم لـــێ دوژمنـــە
چونکـــە چاوکـــاڵ یـــاری منـــە
وەی وەی وەی وەی بارانـــــە

ئەم گۆرانییەش هەر لە کتێبی ناو براو لاپەڕە (٢١١) دا بلاْوکراوەتەوە .

# Goranî “ Wek Qumrî ”

Wek qumrî ser balim şîne

Kar û pîşem her grîne

Esmeran xwênyan şîrîne

Wey wey wey wey barane

* *  * *

Çawî reşit be xumarewe

Memkit sêwe be ddarewe

Xwa pêy dawî meyşare we

Wey wey wey wey barane

گۆرانــی " وەك قومــری "

## گۆرانی " ئامینێ نازەنینێ "

ئامینێم نازەنینێ وەی وەی لە سیرەی پۆتینێ

بالاٚم بە بالاٚی ئەو کچە گرت دوو پەنجە کورتی دینێ

عەبا لەسەر کەوایە دوگمە لە سەر مەمکانی

پیلی ئەو کچەم دەنێ دەرمکەن لە سلێمانی

ئەرێ سێ جار بەو مانگەی چاوەکەم خەرمانەی داوە

ئەرێ ئێستا مەیلی تۆم گیانەکەم بەکەس نەداوە

قەمەرەکی بۆ دەگرم دەیبەم بۆ لای چوار تایێ

پیلی ئەو کچەم دەنێ دەرمکەن لە دونیایێ

ئامینێم گوڵ هەنارە ترش و شیرین و مەزەدارە

بە ڕۆژ قەولم پێ دەدا شەوهات لێمان بێزارە

ئامینێ گوڵ وەنەوشێ جارجار خۆی بەناز دەفرۆشێ

کارێکم لێ قەوماوە یار بەجوانی خۆی دەمبەخشێ

ئەم گۆرانییەش هەر لە کتێبی "گوڵی سەربەستی" لاپەڕە (١٨٣) دا بلاٚوکراوەتەوە .

# Goranî " Amînê Nazenînê "

Amînim nazeninê wey wey lesîrey potînê

Balam be balay ewkiçê girt dû pence kurtî dênê

Eba le ser kewaye dugme le ser memkanî

Pîlî ew kiçem denê dermken le silêmanî

Erê sê car bew mangey çawekem xermaney dawe

Erê êsta meylî tom gyanekem bekes nedawe

گۆرانی " ئامینێ نازەنینێ "

میانی (٦) دەنگی (راست) لەسەر (SOL)

10
16

(دەزەم)

# سەرەتای بەشی پێنجەم

لەم بەشەیاندا سوودم لە کتێبی " فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری " وەرگرتووە کە (٢٠٤) لاپەڕەیەو ساڵی (١٩٧٤) لە چاپ دراوە، مامۆستای بەڕێزیش " محەمەد کەریم شەریف " کۆی کردۆتەوە ئامادەی کردووە.

کارەکەی مامۆستای ناوبراو زۆر پیرۆزە، چونکە لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ بێشك بەشێکی زۆر لەو هەڵبەستە فۆلکلۆری‌یانە لەوانە بوو نەمێنن و لە بیر بچنەوە، بەلام خوێن گەرمیو لە خۆ بوردن و هەست بە خزمەتکردنی میراتی نەتەوایەتی پاڵیان بەو مامۆستا دڵسۆزەوە ناوە کە ئەم ئەرکە پیرۆزو زەحمەتە بگرێتە ئەستۆو بە مەرامی بگەیەنێ و وەکو ئەرشیف نەك هەر بۆ ئێمە بەڵکو بۆ نەوەکانی دوای ئێمەشی بپارێزێ . . .

خۆ ئەگەر بهاتایە کاتی خۆی لە تەك هەڵبەستە فۆلکلۆریەکانی بە چاپی گەیاندوو (نزم–ئاواز)ە کانیشی بۆمان تۆمار بکردبایە .

ئەوە هەرگیز کارەکەی نەدەهاتە نرخاندن و زۆر تەواوو بایەخدار تردە بوو . . .

بۆیە ئەوەتانێ بە ناچاری من ماوەیێکی دوورو درێژە . . . بۆ جاری دووەم هەر بە گوێرەی کتێبەکەی ناوبراویش گەڕانی مەیدانی دەکەم بە مەبەستی گەیشتنە ئاوازە ڕەسەنەکانی ناو هەمان کتێب ، تا لەبیر نەچوونەتەوە ، دەبێ ئەوەش بدرکێنم بوونی کتێبەکە کارەکەی منی ئاسانترکرد ، هەروەها مامۆستای ناوبراویش زۆر کەس و گوندی بۆ دەست نیشان کردم کە لەم دواییەدا توانیم بچم بۆ لایان و چاوم پێیان بکەوێ و سوودی چاکیشیان لێ بینم . لە کاتی چاوپێکەوتنەکانمدا بە کەسانی فۆلکلۆری، گەلێ جار کە گۆرانییەکیان بۆ دەگۆتم لە وانەی ناو کتێبەکە کۆپلەیەك یا زیاتریان بۆ زێدە دەکرد و هەندێ جاریش گۆڕانیان لە هەڵبەستەکاندا دەکرد ، بۆیە من ئەو کۆپلە زیادانەم و گۆڕانکاریانەم نووسیوەتەوەو هەندێ لەو گۆرانییانەی چ لە هەڵبەست یا ئاوازیان بەشت بووم یا بە تەواوی دڵنیا نەبووم ، جارێ لێیان گەڕام–گەر تەمەن بوو– ئەوە لە بەرگەکانی دیکەی کتێبەکەمدا بە ئەنجامیان دەگەیەنم.

## گۆرانی "شەنەبا"

بایێ شەمار بە هاوینێ
دەیدا لە رەندەی جۆخینێ
خەو خۆشە لەگەر ئامینێ

* *   * *

بایێ شەمار بە پایزێ
شیرین دەیدا لەدار گیزێ
خەو خۆشە لەگەر مامزێ

* *   * *

بایێ شەمار بە زستانێ
شیرین دەیدا لە کۆتانێ
خەو خۆشە لەگەر گوستانێ

* *   * *

بایێ شەمار بە بوارێ
دەیدا لە پەلکی چنارێ
خەو خۆشە لەگەر نازدارێ

* *   * *

بایێ شەمار کزەی جەرگم
خواردنم ژەهرە دڕا بەرگم
پاشی یارێ جوانە مەرگەم

ئەم هەڵبەستە لە پەڕتووکی ( فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری-لاپەڕە(٣٠) ) بڵاوکراوەتەوە.

# Goranî “ Şene ba ”

Bayê şemar be hawînê

Deyda le rendey coxînê

Xew xoşe le ger amînê

* *  * *

Bayê şemar be payizê

Şîrîn deyda le dar gîzê

Xow xoşe le ger mamizê

گۆرانی " شەنەبا "

# گۆرانی " ساوار کوتان "

حەللاو یا ئەڵلا    یا ئەڵلاهو یا نەبی

قەومی جووان کۆرەبی    کیژیان جوانە لۆمەبی

ئەو ساوارە هەر برووشە    ئاگات لیَبی کابان تووشە

یا ڵلاو یا ئەڵلا و . . .

ئەو ساوارە لە حەمبارە    گەنمی پارە لۆ ئەوسارە

ئاگات لیَبی کابان هارە    یا ڵلاو . . .

دە لێدە دەبکوتە    بیکە کا بیدە با

کیژ لێنیَ کورِ بخوا    یا ڵلاو . . .

دە لێدەوە سەر لە نوو    لە ساران کەت بەفری نوو

کیژ مامزە کورِ لە دوو    یا ڵلاو . . .

دەن لە ناوی دەرینن چاوی    لە بۆ خاتری زی بەدراوی

دەن لە رۆخی دەرینن پۆخی    لە بۆ خاتری مەمك خۆخی

لەگەر تۆمە تۆ بگێڕەوە    چاوی حیزت مەشێرەوە

ئەوی لەکنت بی نێرەوە    بە کلدان و ئاوێنەوە

یا ڵلاو . . .

لەگەر تۆمە بەتۆ دەرێم    ئاشقی شەمامەی باغەرێم

سوندم خواردییە بەکەس نەرێم    یا ڵلاو . . .

لەگەر تۆمە ئەی خەجیلە    سینگ و مەمکت بەکلیلە

وەك عارەبێت بم دەخیلە    دە ماچێکم دیَ بە حیلە

* *   * *

لەگەر تۆمە چاو ئەستێرە      هەر ئەو شەومان ماوە لێرە
خزمەتێکمان پێ بسپێرە      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە عەلییە سۆورە      ئەورۆ سەیرە و ڕاوە پۆڕە
لە جیرانان درمە گۆڕە      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە ئەی حەیاتم      تازە لەکن داکت هاتم
ئەتووی کردییە بە خەراتم      لە باتی مووچە و بەراتم

* *      * *

لەگەر تۆمە لە گەریتە      گەردەن مامزی بە قەرێتە
ئاقردار بووم لۆت بووم شێتە      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە چاوی چاوم      لەسەر تۆ چەندیان لیٚداوم
لە من وابێ خەرات کراوم      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە لە گەرت بم      ئەرقەو ڕێزی دوگمانت بم
یارێ ئەو شۆ مێوانت بم      یا لٚلاو . . .

* *      * *

لەگەر تۆمە ئەی حەبیبم      من بریندارم تۆی تەبیبم
خودا بتکا بە نسیبم      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە تۆ برێ بەرێ      چاوت شینکەی باران پەرێ
بەو شێخەکەی لە کودەرێ      کچێ ڕاوەستە بامانگ (هەرێ)
لەگەر تۆمە ئەی فاتوومە      سینگت مەسینەو گومگومە
خۆم قاوەچی تۆم لازمە      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە تۆ برێ چاکە      لەناو ماران پێم برێ کاکە
لە جێگای چۆل سینگ والاکە      یا لٚلاو . . .
لەگەر تۆمە حەسەن یایێ      بەژنت بیێ خانەقایێ
دووشت خۆشە لە دنیایێ      ئیمان و چاوی لە یلایێ

ئەم هەڵبەستەش هەر لە (فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری لاپەڕە (٤٨) ) دا بلاٚوکراوەتەوە تا لاپەڕە (٧٤) ، ئەوەی دیەوێ تەواوی هەڵبەستەکەی دەسکەوێ بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی سەرەوە ... هەرچەندە ناتوانین ئەویش بە تەواو دانێین واتە ئەم هەڵبەستە زۆر لەوەش زیاترە لە زۆر کتێب و گوڤارو رۆژنامەدا هی دیکەشی لی بلاٚوکراوەتەوە ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە (ساوار کوتان) دوو جۆرە(نزم-ئاواز)ی هەیە ئەوەی ئێستا خیرایە بەناوی (یاڵلا و حەڵلاو)ەیە، ئەوی دی لە دوایدا باسی دەکەین.

# Goranî " Sawar Kutan "

Hellaw ya ella ya ellahû ya nebî
Qewmî cûwan kore bî kîjyan cwane lome bî
Ew saware her birûşe  Agat lêbê kaban tûşe
Yalla û ya ellaû

* *    * *

Ew saware le hembare
        Genmî ꞥare lo ew sare
Agat lê bê kaban hare . . .
        Yall û  . . .

Moderato

گۆرانی " ساوار کوتـان "

# گۆرانی " دروێنەی بەکرەی "(١)

ڕۆژ هەراتو تاو هەرات          لەسەر سەرێی سەفینی

هە دروونە دروونە دروونە          دەسکێ داسێم بە ڕوونە

کیشەکەر فێرە قوونە

* *   * *

زێی موسڵێ چەند پانە

هاتییە دوو کراس کتانە

یەك خەیاڵ یەك ئەسڵانە

* *   * *

خەیاڵ و ئەسڵان خوشکن          چوون لەسەر زێ دانیشتن

دەست و بازنیان شوشتن          وەکی گوڵێ پشکفتن

قەیاغوانان دەکوشتن

* *   * *

خەیاڵم شەکرە سێوە

کەتە بەحری نەپێوە

ماسییان خوارد کەپوو و لێوە

* *   * *

خەیاڵی ئەحمەد بەگی

کەتە بەحری نەهەنگی

ماسییان خوارد بە بێ دەنگی

* *   * *

سەرێ بەندانم هەمین          لەدوای بەندانم هەمین

بسکی بەردا چین بە چین          بابی بمری بێ یاسین

داکی بمری بێتەلقین

* *   * *

سەرێ بەندانم عەیشێ          لەدووای بەندانم عەیشێ

هورد هورد دەروا لە حەوشێ          غرمەی دێ لە بن کەوشێ

منداڵەو لەبەمن ناشێ

* *   * *

عەیشۆکم زۆر منداڵە          بە عومر چاردە ساڵە

وەڵلا بەخۆی دەشێنم          بە مەلای دوازدە عیلم

سەرێ بەندان ستییە          لە دووای بەندان ستییە

زەندی سپی پڕ بازن          وەك بالیفی ماری یە

هەتیم وەرە ماڵیمە          بینێ لەبن سەرییە

بابم چوویتە هەولێرێ          کاکم لەکن مەڕییە

ئەوان لە ماڵێ نەبن          داکیشم بێ قەیدییە

دەوم لە گەردەنی نا          دوو ماچم لێ کردیە

چاوی ئەستێرەی ڕۆژێ          غەزال دەوری گرتییە

* *   * *

یەك لە ماران هاتەدەر          چاو ڕەش ناسکە بێرییە

بە دەستی عیشارگەیدا          کەسمان لەمارێ نییە

بابم چوویتە هەولێرێ          برام وا لە ئاشییە

سەمان سەڕەوێ نابەن          پیرە داك چاوی نیە

* *   * *

هـــــــەی دە وەرە دە وەرە | چـــاو ڕەش وەرە دەمـــەکێ
نوشتییەکمان کرد بە مەلای | بـابت بچێ لـۆ دەشـتێ
لـنیێی بێتە بـەفرو بـاران | بـا مـردار بـێ لـە دەشـتێ

** **

هـەی نەرمـە نەرمـە نەرمـە | هاوینیـان چـەندە گەرمـە

زسـتانان شـەختەو سـەرما | هـاتم نـەرمێ ڕامووسـم

کیژۆڵێ عـەیب و شـەرمە

** **

لـێرە مـەچووە روانـدزێ | روومـەت پـەلکی نـێرگزێ
رامووسـان لـەکێ خۆشـە | لـەبڵندایێ پـەرێزێ
گوتمـێ بێنـە مـاچت کـەم | خـۆی هاویشـتمە ئـامێزێ
لەبـەر ئـەو کیـژە جوانـە | دنیـام لەبـەر دەبـێزێ

** **

ئەم هەڵبەستەش هەر لە کتێبی (فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری - لاپەرە ٧٦ تا لاپەرە ٩٦ بلاّو کراوەتەوە وە زۆر هەڵبەستی دی هەنە لای من کە هەر بەهەمان (ئاواز - نزم ) دەگوترێن ، وە زۆر پارچە هەڵبەستی دی لە ناو گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بلاّوکرانەتەوە هەشە تائەمرۆ دەرنەکەوتووە و بلاّونەکراوەتەوە .

١)ئەم ئاوازەی دروێنەی بەکرەیی بۆ زۆر هەڵبەستی دی دەگوترێ وەك (نزمی حەوایی - یاخود نزمی گران - لەسەرخۆ )ی ساوار کوتان و هەڵبەستی خوارەوەش کە بە تەواوی لە لاپەرە ( ١٨٧ )دا بلاّوکراوەتەوە ، هەر بەهەمان ئاوازدەگوترێ .

هەڕاوە ڕاوە ڕاو لەبنەی پردێیە .........هتد

## Goranî " Drwêney bekrey "

Roj herat û taw herat
He drûne drûne drûne le ser seryê
sefînî
Deskê dasêm be rûne
Kîşeker fêre qûne

* *    * *

Zê muslê çend pane
Hatîye dû kiras kitane
Yek xeyal yek eslane

* *    * *

Xeyal û eslan xuşkin
Çûn le ser  zê danistin
Dest û bazinyan şuştin
Wekî gulê pışkiftin

گۆرانی " دروێنەی بەکرەیی "

## گۆرانی " لەکێم دیت و لەکێم دیت "

دوو ڕەشــــماڵی ڕەشــــکۆکە

لـــە دۆڵـــەکیان هـــەڵدابوو

کیژێکــــی بــــالاّ بـــەرز

لەدەرکـــەی ڕاوەســـتابوو

دەستم لـە بـۆ مـەمکی بـرد

زار مـــەمك بەرهـــەڵلابوو

هـــاتم بگـــەم بـــە مـــرادم

قیامـــەتم لـــێ ڕابـــوو

* * * *

لـە کێـم دی بـرا لـــەکێم دی

یـــار لـــە محـــای کۆیـــە

یـــار لـــە پـــەرێزە جۆیـــە

ســـەری کولـمـی ســـووتابوو

لەبـــەر هـــەرمی مەرۆیـــە

دەلـــێی عەســـکەری تورکـــە(١)

دەچینـــە قشـــلەکەی کۆیـــە(٢)

* * * *

لـە کێـم دی بـرا لـــەکێم دی

لـــە چۆمەکـــەی هـــیرانێ

یـــارم کۆتـــرە بـــاریك بـــوو

بـــۆ خـــۆم گرتـــم لـــەلانێ

فکـــرم وابـــوو کـــەوی کـــەم

بـــۆ خـــاتری تێرامـــانێ

ئەویشم لەدەست فڕی

چوو بۆ تاقی ئاسمانێ

هیچم وەدەست خۆم نەهێشت

دەستم کرد بە گریانێ

* *   * *

لە کێم دی برا لەکێم دی

لەشینکی نۆغەرانێ

گەواڵەکی دە هینا

دایدا تەزرەو بارانێ

دەیدا لەقوڵنگی پۆرێ

لەشابسکی حەیرانێ

لیفکەی یارێمن تەڕبوو

لەزار دەرکی هەیوانێ

بابی لەیلەم کردە جوو

دامنا لەسەر خمخانێ

ڕۆژێ سەد داری لێدەن

یارە جوانێ

ئەو سەد دارەش ئی چی بوو

بەرتیلی چاو جوانێ

ئەمەی سەرەوەم لە منداڵیەوە تا ساڵی ( ١٩٦٩ )* لە خواڵێخۆشبووی باوکم و برادەرانیم گوێ لێ بووە ، وە هەڵبستەکە زۆر لەوە زیاترە بەڵام من هەر هەندەم لەبیرماوە . بۆ زیاتر ئاگاداری هەڵبەستەکە بڕوانە کتێبی (فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری ) لاپەرە (٨٤) .

* تیپی مۆسیقای خانزاد ساڵی ١٩٨٣ ئەم گۆرانیەی هەر بەو هەڵبەستەی سەرەوە تۆمار کرد بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك

.(١) هەندێ جار لەجیاتی (تورکە) (کوردە) بەکار دەهات.(٢) دیسانەوە هەندێ جار لەباتی (قشلەکەی کۆیە ) دەیان گوت (قشلەی زاخۆیە ) .

* واتە ساڵی کۆچ کردنی باوکم

# Goranî “ Le Kêm dîtû le kêm dît ”

Dû reşmalî reşkoke
Le dolekyan helda bû
Kîjêkî bala berz
Le derkey rawesta bû
Destim le bo memkî bird
Zar memik ber hella bû
Hatim bigem be miradim
Qıyametim lê ra bû

Animato

(A) dû reş ma rî reş ko ke Le do rek yan- her da bû des tim Le
bo mem ki bird zar me mik ber hel la bû (B) hîç ke sim Le wê ne
dît qî ya me tim Lê ra bû D.C.

گۆرانی ” لەکێم دیت و لەکێم دیت “

# گۆرانی " هانام بەبەر خالقی "

هانام بەبەر خالقی
هەزارو یەکی ناوە
عاسمانەکی بەرز بێ
چلەو ئەستوون وەستاوە
بەشەو تاریك و نوتەك
بەرۆژ خۆرو هەتاوە
لەجێجێ ووشك و دێمە
لەجێجێ بەحرو ئاوە
دیتم یارم دانیشتبوو
لەسەر ئەو کانی و ئاوە
بەسەر سەلامم لێکرد
بەچاو عەلێکی داوە
کچە تیوە ماڵ کاول
بۆچی مەیلت نەماوە
هەتیم چبکەم چ نەکەم
غوربەتم لۆت هەستاوە
ئەگەر بتدەمێ ماچێ
لە عام دەیکەی بڵاوە
نەبەو قورعانەی کەمە
خودای گەورە دایناوە
بەجەمعی مشایەخان
چی مردیەو چی ماوە

بو تەواوی ئەم هەڵبەستە بگەرێوە بۆ سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (٨٨) .

# Goranî " Hanam be ber Xalıqî "

Hanam be ber xaliqî
Hezar û yekînawe
Asmanekî berz bê
Çilew estûn westawe
Be şew tarîk û nûtek
Be roj xor û hetawe
Le cê cê wişk û dême
Le cê cê behr û awe

گۆرانی ( هانام بەبەر خالقی )

## گۆرانی (هۆ لەیلی لەیلی)

هۆ لەیلی لەیلی لەیلم ناز مەکە
دەگرم شەمامان داکت گاز مەکە
شەمامەی سۆران تەرحی لیمۆیێ
لۆم بە هەدییە هات لەلای شنۆیێ
هۆ لەیلی لەیلی لەیلم ناز مەکە
دەگرم شەمامان داکت بانگ مەکە
شەمامەی خەت خەت تەرحی بیزایێ
ناردیتم لۆت بێ لەلای بەغدایێ
هۆ لەیلی لەیلی لەیلم ناز مەکە
شەمامەی خەت خەت تەرحی کولیکێ
ناردیتم لۆت بێ لەلای کەرکوکێ
هۆ لەیلی لەیلی لەیلم ناز مەکە
شەمامەی زەردن تەرحی نێرگزی
ناردیتم لۆت بێ لە رواندزێ
هۆ لەیلی لەیلی لەیلم ناز مەکە
دەگرم شەمامان داکت بانگ مەکە

# Goranî " Ho Leylê Leylî "

Holeylî laylim nazmeke

Degrim ṣemaman dakit gaz meke

Semamey sorin terhî limoyê

Lom be hedîye hat le lay ṣinoyê

Holeylî leylî leylîm naz meke

Degrim ṣemaman dakit bang me ke

گۆرانی (هۆ لەیلی لەیلی)

## گۆرانی " دەك نەمێنێم "

دەك نەمێنێم ها ئەززە
سینگت بیستان و ڕەززە
بەدڵی خۆم لێکرد حەززە
حەزم کردییە لە چاوی
لەسێ بەندەی کڵاوی
ناوێرم بینم ناوی
وەی لەبەر پیرە باوی

* * * *

دەك نەمێنێم نەمێنێم
دەك نەمێنێم سیدەکان
مەفتەنی چاو بەڵەکان
دوگمە و سێ ڕێزی قەیتان
بەجارەکی لەخۆدان
دنیا بوو ئاخر زەمان

---

لەهەمان سەرچاوە لاپەڕە(٩٧) دا بە ناتەواوی بلاوکراوەتەوە ، تیپی خانزادی کچان ساڵی ١٩٨٢ ئەم گۆرانی‌یەی بۆ پرۆگرامی (شەوی پاریزگای هەولێر) کە لەلایەن برای دەرهێنەر(ناسر حەسەن )ە وە ئەنجام درا بۆ تەلەفزیۆنی بەغدا و بە دەنگی (ڤیان فائق ) تۆمار کرد .

---

تەواوی ئەم هەڵبەست و ئاوازەشم لەحەیران بێژی کورد ( رەسول بیزار گەردی) گوێ لی بووە و وەرگرتووە .

# Goranî " Dek nemînêm "

Dek nemînêm ha ezze
Sîngit bîstan û rezze
Be dilê xom lêkird hezze
Hezim kirdiye le çawî
Le sê bendey kîlawî
Nawêrım bînim nawî
Wey le ber pîre bawî

* * *

Dek nemînêm nemînêm
Dek nemînêm sîdekan
Meftenî çaw belekan
Dugme û sêrêzî qeytan
Be carekî le xodan
Dinya bû axir zeman

♩.= 120

D.C.

گۆرانی (دەك نەمینم)

رەگەزی (٣) رەنگی (نەهاوەند) لەسەر (La)

6/8 (بڕەزم)

## گۆرانی " کەچەرەك بووم لە کاروانی "

کەچەرەك بووم لە کاروانی
هەتیمەك بووم لە کاروانی
دیتم مارەك لە تەلانی
لام دا ماریان لە بۆ نانی
دیتم زەری یەك لەبەر نانی
سوبحانەللاَ چەندە جوانی
وەکی گوری ناو باغانی
هەتیم کەچەر بگرە نانی
تۆ بەجێمای لە کاروانی
وەللاَ زەری ناگرم نانی
هەتا نەت کەم راموسانی
سەت حاشابی لە کاروانی
بیژی کەچەر چەند زۆرەوی
مستەکت دەم لەدور دەوی
چەنەو زارت بەیەك کەوی
سەرت بروا قالبت کەوی
بمری دەوت پێ ناکەوی
چار برام هەنە وەکی شێرە
گازیان دەم بێنە ئێرە
بە خەنجەران بتکەن گێرە
ئەوجا کەچەر ئۆغرت خێرە
بەخوا زەردی نارۆم لێرە
هەر چار برات بێنە ئێرە
بە خەنجەران دەیکەین گێرە
لەسەر سینگت کەلا دێرە
ئەوشۆ ماچی دەکەم تێرە
بێ شەرعی نییەو زۆر خێرە
دەبمە کۆتری بار سپیە

چل گەز دەچمە بن هەوری یە
کەس بەردی تی نەگرتی یە
ئەوجا کەچەر دەردت چیە
ئەتوو کۆتری من کۆللارە
پەڕو بارم شێست و چارە
لە عاسمانێت دینمە خارە
بە مامۆستای دەتکەم مارە
بە سندان بێتن ئەو عارە
ئیسمەکی لەخۆ دەخینم
دەبم بە قەڵاتی دم دم
دەچمە بەر دەستی حاکم
ئەز ئینسمەکت لێ دەخینم
لە عەردانت دەگەوزینم
لێف و دۆشەگ و بن سەر
بەخۆم لە حاکمی دەستینم
کوڕە کەچەر ئەمن مارم
ئەتوو ماری من شاهینم
لەبن عەردت دەردینم
لەکن مەلای دەتگەوزینم
بەژنم قەراتێ میری یە
چەند ئاغان لە دیار خەفتی یە
یەك بەردەکیان نەبزافتی یە
ئەوجا کەچەر دەردت چی یە؟
تۆ قەراتی من لەشکرم
حەفت ساران لەبن دەوەڕم
یان دەتگرم یان دەمرم

بۆ تەواوی ئەم هەڵبەستە بنوارە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (١١٦)

# Goranî “Keçerek bûm le karwanî ”

Keçerek bûm le karwanî

Hetîmek bûm le karwanî

Dîtim marek le telanî

Lamda maryan le bo nanî

Dîtim zerîyek le ber nanî

Subhanella çende cwanî

Wekî gurî naw baxanî

گۆرانی " کەچەرەك بووم لە کاروانی "

# گۆرانـــی " شـــەوزەلار "

شەوزەلار شـەوزەلار شـەوزەکەی حـەمرم
جــاتخوا شــل و مــل مەهێلــە و بمـــرم
مارمـــان مارێکـــە و چیغمـــان جودایـــە
عـــەیفم بـــۆ بــالای شـــەو بـــە تەنیایـــە
مارمـــان مارێکـــە ســـەرتیل بـــە ســـەرتیل
چـــەندت دەرخـــوار دام مـــاچی بێبـــەرتیل
قـــەراتی هـــەولێر بـــە میـــتر و گـــــەزە
مـــاچی ئەوکچـــە لـــە بـــۆ مـــن فـــەرزە
لـــە دوور دیـــارە پۆشـــی یەکـــەی ســـۆرە
یـــان یـــاری خۆمـــە یـــان زەینـــم کـــۆرە
عـەفت سـار سۆفی بـووم لەبـەغدا زەمیـن
چـاوم بـە یـار کـەت وەرگـەڕام لـە دیـــن
ئـــەو عەوشـــە گـــەورە بـــەجیرانم بـــی
کیژەکیـــان هەیـــە دەســـگیرانم بـــی
هـــەی دادو بـــێ داد خـــۆ مـــن نـــەماوم
وەك جۆگەلـەی ئـاو خیـن دێ لـە چـــاوم

ئەم هەڵبەستەش هەر سەرچاوەی پێشوو لاپەرە (١٤٣)دا بلاو کراوەتەوە.

# Goranî “ Şewzelar ”

Şewzelar şewzelar şewzekey hemrim

Catixwa şilumil mehêle bimrim

Marman marêke çîxman cudaye

Heyfim bo balay yar şew betenyaye

Marman marêke sertîl be sertîl

Çendit derxward dam maçî bê bertîl

گۆرانــی “ شــەوزەلار ”

## گۆرانی " هانایێت بەبەر دەبەم"

هانایت بەبەر دەبەم

دووەمین بەبەر سوبحانی

ـەپێش ماڕیان دا هاتم

دانیشتبوو بە بەر نانی

بسکی بە جوت باداوە

کەتبووە سەر شلکەی ڕانی

کلدانی خۆی تێهەردا

هاویشتمە بن گیرفانی

بێوەژنەکی زۆر مەکرۆ

پێش حالەمێ ی زانی

سەد هێستری بارەبان

بار ناکرێ لە مەکرانێ

سەد مەلای دوازدە عیلم

دەرناکەن لە عینوانی

یەك ڕۆژان لە دووی گەڕام

تازە لۆم دێتە خانی

دەستم هاوێشتە ملی

دەهات بۆنی مەمەکانی

هێشتا ئەو بە منی دەگۆ

کورە ئەتوو زۆر زانی

بۆ تەواوی ئەم هەڵبەستە بنوارە سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ( ١٥٢ ) بکە .

# Goranî “ Hanayêt be ber debem ”

Hanayêt be ber debem

Dûmîn be ber subhanî

Be pêṣ maryan dahatim

Daniṣtibû le ber nanî

Biskî be cot ba deda

Ketbiwe ser ṣılkey ranî

گورانی " هانایێت بەبەر دەبەم"

## سەر دولکەیٚ " دیوانە و دیوە خانە "

دیوانە و دیوە خانە
کورم لاویٚ دیوانە
دیوەخانی لە تیشی
هەلاش پەلکی قەمیشی
کاکەم تیٚدا دەنیشی
بەردەوە گوٚلینگ و ریشی
دیوەخان سەر هەورازە
چاوشان گازە گازە
دونیا لە لاویٚ ترازە
دیوەخان سەرنشیوە
چاوشان لیٚوە لیٚوە
دونیا لە لاویٚ شیٚوە
دیوەخانیٚ لە بلٚندی
نەچاوش ما نە ئەفەندی
دیوەخان چاکرا دوونیٚ
هەلاٚش گولٚی بەیبوونیٚ
کاکەم گوٚتییە خاتوونیٚ
نەمام لەویٚ قانوونیٚ
هات گەییە بەستوٚریٚ
چەقەلٚم بەردا پوٚریٚ
کا خودانیٚ لفکە شوٚریٚ

بوٚ تەواوی ئەم هەلبەستە بنوارە سەرچاوەی پیٚشوو لاپەرە (٢٢٢).

# Serdulkey " Dîwane u Dîwane "

Dîwane u dîwaxne

Kurim lawê dîwane

Dewexanê letîşî

Kakem têda denîşî

Berdewe gulıng u rîşî

Dîwexan ser hewraze

Çawşan gaze gaze

Dunya le lawê tiraze

سەر دولکەی " دیوانە و دیوە خانە "

ڕەگەزی (٤)، دەنگی (هەمایۆن)، لە سەر (SOL)

10/16 (ڕیزم)

## Goranî “ Hey Pêdaw û pê da ”

## گۆرانی " هەی پێداو پێداو "

بۆ شایی تەمبوڵی دەگوترێ

Hey pêdaû pêda tembolê pêda
Naçme zaxoyê gelê sipî zirêda
Çemê başoqêm çemêkî qore
Be xom lê çandiye şitle gendore
Çemê başoqêm çemêkî pane
Lo xom bijardiye kam yar cwane

هـەی پیـداو پێـداو تـەمبولی پێـدا
ناچمە زاخوگـی گـەلی سـپی زرێـدا
چـەمێ بـە عشـۆقێم چـەمێکی قـۆرە
بـە خـۆم لـێ چاندیـە شتلە گنـدۆرە
چـەمێ بـە عشـۆقێم چـەمێکی پانــە
لۆخـۆم بژاردیـە کـام یـار جوانــە

بـۆ زیـاتر ئاگـاداری هەڵبەسـتەکە تەماشـای سـەرچاوەی پێشـوو لاپـەرە (٢٢٨) بکـە

Andantino

(A)

hey pê dew— pê— dew tem bo lam— yê pê— de

D.C.

گۆرانـی " هـەی پێـداو پێـداو "

(R) رەگەزی (٣) دەنگی دەرچەم لە سەر (A)

(پڕەزم)

2/4

Goranî “ Fatimê zalimê ”

گۆرانی " فاتمی زالمی "

Fatimê zalimê Kîstanim dîtin dîtin
Fatimê zalimê çend be befrû cilîtin
Fatimê zalimê memkî kîjoran qîtin
Fatimê zalimê le kengî heta kengî
Fatimê zalimê memikit sêwê ferengî
Fatimê zalimê Lom nagîrê be çengî

بۆ شایی سوسکەیی دەگوترێ

فاتمیٚ زالمیٚ کیستانم دیتن دیتن
فاتمیٚ زالمیٚ چەند بە بەفرو جلیتن
فاتمیٚ زالمیٚ مەمکی کیژۆران قیتن
فاتمیٚ زالمیٚ لە کەنگی هەتا کەنگی
فاتمیٚ زالمیٚ مەمکت سێوی فەرەنگی
فاتمیٚ زالمیٚ لۆم ناگیریٚ بە چەنگی

هەمان سەرچاوەی لاپەرە ( ٢٣١ )

♩.=120
(A)
fa- ti mê w za- li mê w e we ha te We ye

♩=132
(A)
fa ya tim mê za ya lim mê kês ta nim dî tin dî tin (B) fa a tim mê
za a lim mê mem kî kî jo ran qî tin

(A) ( ٣ ) دەنگی ( عەجەم ) لە سەر ( SOL )

6/8 ( A - ڕەزمی )

بەشی (B) ڕەگەزی (٤) دەنگی (هەمایۆن) لە سەر (SOL)

2/4 ( B - ڕەزمی )

# گۆرانی " ئایشۆکێ "

## هەر بۆشایی ئایشۆکێ دەگورێ

ئایشۆکێ وەیشێ وەیشێ

هێ دەلالێ وەیشێ وەیشێ

سوك سوك دەروا لە حەوشێ

ئایشۆکێ ئایشێ شێخی

ئێواران جێ ی رادێخی

بە لەنجەی پیاوی دێخی

ئایشۆکێ وەیشێ وەیشێ

هێ دەلالێ ئایشێ وایشێ

وورد وورد دەڕوا لە حەوشێ

ئایشۆکێ مەچووە داران

دەتگەنێ لاوکێ جاران

دەپسێنن بەندگێ گواران

ئایشۆکێ ئایشێ وەیشێ

هێ دەلالێ ئایشێ وەیشێ

سوك سوك دەروا لە حەوشێ

هەر لە کتێبی (فۆلکلۆری هۆنراوەی کوردەواری ) لاپەرە (٢٣٦) دا بلاو کراوەتەوە .

# Goranî “Ayşokê ”

Ayşokê weyşê weyşê

Hê delalê weyşê weyşê

Sûk sûk derwa le hewşê

Ayşokê ayşê şêxî

Ewaran cêy ra dêxî

Be lencey piyawî dêxî

گۆرانــی ” ئایشــۆکێ “

## بۆ ئاگاداری خوێنەری ئازیز دەڵێم :

هەندێ لەم نۆتە فۆلکلۆرییانەم واتە ( هی بەشی پێنجەم ) پێش ماوەیەك لە کتێبی ( فۆلکلۆری کوردی ) دا کە هەڵبەستەکانی لە لایەن کاك سعدوللا ئیسماعیل شێخانی ئامادەو کۆکراوبوونەوە بلاو کردەوە ، ئەم کارەشم بۆیە کرد چونکە دیتم کەنجێکی کورد خۆی خەریك کردوە بە کارێکی سوود بەخش ،ئەگینا ئەم کارە لەوە زیاتر سوودی بەمن نەگەیاندووە .......... کەجاری دووەمیش هاتەوە بۆلام بۆ ئەوەی هەندێکی دی نۆتەی ئاوازی فۆلکلۆری بۆ بنووسمەوە - کە لەسەر کاسێت تۆمارکرابوون - زۆر دڵخۆش بووم بەسوور بوونی ئەم کورە لەسەر خزمەتکردنی میراتی بەجێماوی باب و باپیران ، یەکسەر ڕەزامەندیم پیشاندا بە مەرجێك (١) هەر نۆتەیەك لە لاپەرەیەکی سەر بەخۆدا بلاوبکرێتەوە(٢). دەنا بۆی ئەنجام نادەم . . . ئەویش زۆر بەگەرمی یەوە دڵنیای کردم و گوتی چۆنت دەوێ ئاوا دەبێ ؟ بەلام ئەوەی جێگای داخ بوو ؟.؟. هەزار جار خۆزگە بە کتێبی یەکەمی لاپەڕەکانی سپی و خاوێن بوون ، هەر چەندە نۆتەکانیش گچکە کرابوونەوە ...(٣) کەچی کتێبی ( گوڵبژێرێك لە فۆلکلۆری کوردی دا جگە لەوەی نۆتەکان لەهی کتێبی یەکەم زیاتر گچکە کرابوونەوە ، لاپەڕەکانیش زەردو بۆرو ناشیرین و هەڵبەستەکانی تێکەڵاوو پەلەیی و شێوە بازرگانیشی زۆر بە ئاشکرایی پێوە دیار بوو ...... بۆیە وەك دیتتان لەبەشی پێنجەم دا بۆ جارێکی دی هەندێ لەو نۆتەو هەڵبەستانەم بۆ بلاوکردنەوە ... بەلام تا لە توانامدابووە بە شێوەیەکی جوان و دیارو لەبار ...

١)ئەوەش بە نیازی ئەوەی کتێبی دووەمی تا بتوانرێ بێکەم و کووڕی بێت و سوودیش لە تاقیکردنەوەی کتێبی یەکەم وەرگیریت .

٢) چونکە من بەدرێژی بۆ برای ناوبراوم باسکرد کە هیچ کاتێك ئاواز لە گۆرانی فۆلکلۆری دا لە هەڵبەستەکە کەمتر نیە ، وەك نمونەش کتێبەکەی (جەمیلە جەمیل) و کتێبی (مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد...)ی مامۆستا (کەریم شارەزا) شم پیشاندا کە چۆن گرنگی بە نۆتەکان دراوە و ئاشکراو جوانن و بە ئاسانی دەدیترێن و دەخوێنرێنەوە .

٣) نۆتەکان بە شێوەیەك گچکە کرابوونەوە کە سوودی لێ ڕەچاو نەکرێ لەلایەك و شێوەی ئەستێرە و خاڵی میان دوو هەڵبەستیشیان وەرگرتبوو لە لایەکی دیکەدا .

# کۆتایی و ئەنجام

دوای ئەوەی لەم کتێبەدا کۆمەڵێك گۆرانی فۆلکلۆریم بە نۆتە نووسی یەوەو هەوڵی شیکردنەوەشم لەگەڵ دان ، وا لەخوارەوە بە شێوەیەکی گشتی و بەکورتی لە هەندێ لایەنی ئەو گۆرانی یانە دەدوێم وەك :

هەڵبەست - ئاواز - ڕەزم واتە ئیقاع .

**(١) هەڵبەست**

لەم کتێبەدا هەڵبەستی فۆلکلۆری هەمەڕەنگتان بەرچاوکەوت ، ئەمن دەزانم شێوازی زانستی نوێ ، هەڵبەستەکان وەك خوارەوە دابەش دەکات : بۆ نمونە ، گۆرانی فۆلکلۆری یاری مندالان ، گۆرانی فۆلکلۆری شایی و هەڵپەرکێ ، گۆرانی یەکانی کارکردن ....تاد بەلاّم ئەوە بۆ کاتێك کە دەزگای فۆلکلۆری تایبەت هەبێت لێژنەی پسپۆڕی جۆراو جۆر پێك بێنێت ، خاوەنی هەموو هەلّ و مەرجێك بێت بەلاّم بۆ ئێمە ، وابزانم تا رۆژێك زووتر بێت ، هێشتا درەنگە بۆیە ، هەولّم داوە زۆرترین گۆرانی لە هەر جۆرێك بووبێت کۆبکەمەوە بە ئەرشیفی نەمری یان بگەیەنم .

بەم دواییە ، هەندێ لەم هەڵبەستانە ، لە هەندێ کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەدا بلاّوکراونەتەو هەندێ لەوانە شتیشیان لەسەر نووسراوەو لەوانەشە لە جێگەیەك زیاتریش بلاّوکرایتەوە ، بۆیە من بەوەندە وازیان لێ دێنم و خۆم بە لایەکانی دیکەوە خەریك دەکەم .

**(٢) ئاواز**

پاش ئەوەی ئاوازی ئەم کۆمەڵە گۆرانی یەم شیکردەوە ، بۆم دەرکەوت کە :

* گۆرانی فۆلکلۆریمان هەیە لە میانی یاخود ڕەگەزی ( ترایکۆرد واتە -٣- دەنگی ) پێکهاتووە وەك گۆرانی ( هەی پێداو پێدە ، هۆب زەندان ، دەك نەمینێم ئەلەززە - تاد )
* ئی دیکەمان هەیە لە ڕەگەزی ( تیتراکۆرد واتە ( ٤ ) دەنگی ) پێکهاتووە وەك گۆرانی ( شەوزەلار ، گۆرانی ساوارکوتان ، سەردولکەی دیوانە ... تاد )
* هەشمانە لە ڕەگەزی ( ٥ ) دەنگی پێکهاتووە ، وەك گۆرانی ( لەکێم دیت ، چارۆگێ ، گەردوون من چیبکەم .... تاد )
* گۆرانی دیکەمان هەیە لەڕەگەزی ( ٦ ) دەنگی وەك گۆرانی ( ئامینێم نازەنینێ ، وەك قومری سەربالّم شینە ، هۆ لەیلی لەیلی .... تاد )
* کەمێ جاریش ڕوودەدا گۆرانی یەك یا زیاترلە ڕەگەزی ( ٧ ) دەنگی بێت وەك گۆرانی ( هێند بلّندەو هێند قۆزە ).

کەنگین ڕەگەزی گۆرانی لە ( ترایکۆرد واتە - ٣- دەنگ ) زیاتر ، واتە چوار دەنگ و بەرەو ژوور بوو ، ئەوە بە ئاسانی دەتوانین ئـەو ( مـەقام ) ەی ئـاوازی گۆرانـی یەکـەی لەسەر دانراوە ، دەست نیشان بکەین ، هەندێ جار ڕەگـەزی ( ٣ ) دەنگیش دەتوانری مەقامەکەی دەست نیشان بکرێ و جاریش دەبێ ناتوانری .

گەلێ جاریش لە شیکردنەوەی گۆرانی یەکاندا ، نۆتەیەك لە خوار ڕەگەزەکاندا ( کە بە هێڵێك پێکەوەم بەستوون ) دەدیترێ ، ئەم نۆتەیە ( یەدن ) ی پێ دەڵێن . چونکە لەسەر شیکردنەوەی هەر گۆرانی یەك شتێکم نووسیوە : بۆ نمونە :- ( ڕەگەزی ( ٤ ) دەنگی بەیات لەسەر (La) ) بەڵام لە هەندێ لەو گۆرانی یە فۆلکلۆری یانە ، ئاوازەکە پێش ئەوەی لەسەر نۆتەی بنچینەیی مەقامەکە ( کەلەم نمونەیە نۆتەی (La) یە ) بوەستێ ، دادە بەزێتە سەر نوتەی (SOL) کە لێرەدا (یەدن ) ی پێ دەڵێن ، ئەوجا ئاوازەکە دەگەرێتەوە یا (تسلیم ) دەبێتەوە بە نۆتەی بنچینەیی واتە ( اساس - Tonic) ئەو ڕەگەزە . بڕوانە نمونەی خوارەوە :




هەندێ لەو گۆرانی یە فۆلکلۆری یانە بە جۆرێك زیاتر گوتراون ، بۆ نمونە سەیری نۆتەی هەردوو جۆری گۆرانی ( فاتمێ و زاڵمێ ) بکە ، نەك ڕەگەزی بەشی (A) ئەو گۆرانی یە لە ڕەگەزی بەشی (B) جیایە ، بەڵکو ڕەزمەکانیشیان وەك یەك نین .

هەندێ ئاوازی دیکەی ئەو گۆرانی یانە ، ڕاستە شێوەی گشتی یان ( واتە دیمەنی دەرەوەیان )، ناگۆڕێ ، بەڵام سەد لەسەد قالبێکی نەگۆڕاو واتە ( ثابت ) یان نیە ، چونکە گوتنەکەی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی ، هەروەها لە گۆرانی بێژێکەوە بۆ یەکێکی دی ، هەندێ جار هەر ئەو گۆرانی بێژە ، گەردووجار هەر ئەو گۆرانی یە بڵێت ، وردە گۆڕانی تێدادەکات ، لەبەر ئەوە من ناڵێم نۆتەی ئەو گۆرانی یانەی نووسیومەتەوە ، سەد لەسەد تەواون و ئەوە دوا شێوەو قالبە بۆیان ؟ نەخێر .... بەڵکو ئەوەندە دەڵێم :

زێتر لە (٧-٨ ) ساڵان بەدوای ئەو گۆرانی یانەدا گەڕاوم و هەوڵم داوەو بگرە تا ئەمڕۆکەش هەر خەریکم ، ئەوەش بە مەبەستی ئەوەی بە ڕاسترین شێوەی گوتنی ئەم گۆرانی یە ڕەسەنانە بگەم ، لاتان سەیر نەبێت گەربڵێم ، هەندێ لەو گۆرانی یانەم (١٠٠) جار زیاتر گوێ لێگرتووە ! ! ؟ بە دەنگی چەن کەسێکی جیاواز ، ( هەرچەندە هەمووکاتێك ئەوەشمان بۆ ڕێك ناکەوێت ، چونکە گۆرانی فۆلکلۆریمان هەیە ، تەنیا یەك کەس وەبیری ماوەو

گوتنەکەی دەزانێ ، جا لە حاڵەتی وادا ، بەناچاری دەبێ بەو تاقە گوتنە ڕازی بین و پشتی پێ ببەستین ) ، ئەوەندە گوێ گرتنەش لە هەر گۆرانی یەك ، بە مەبەستی ئەوە بووە ، بچمە ناو ناخی گۆرانی یەکەوە و لەکاتی جیا جیادا لەگەڵ ڕەزمەکەمیدا بژیم و بە ووردەکاری و پەناو پێچو نهێنی یەکانی ئاشنابم ، تاوەکو ( تا لە توانا دابێت ) ، ئاوازەکە بەشێوەیەکی تەواو و بێ کەم و کورتی و دوور لە شێواندن و گۆڕانکاری و دوورخستنەوەی ئەو ئاوازە ڕەسەنەو پاراستنی لەشێواندنی مۆرك و ڕەسەنایەتی و تام و بۆ کوردی یەکەی ، پاش ئەوەی بەم شێوەیەی باسم کرد کارەکەم ئەنجام داوە ، هانام بردۆتە بەر هونەرمەندی ڕەسەن و بەتوانا مامۆستا ( ئەنوەر قەرەداخی ) چونکە ئەویش مامەڵەی زۆری لەگەل ئەو جۆرە گۆرانی یە فۆلکلۆری یانە کردووە .

بەو هیوایەی ئەگەر هەڵەیەکم کردبێت ، یاخود دەنگێك ئەمن پێ ی نەوێرابم ، ئەو بەسوپاسەوە بۆمی ڕاست بکاتەوە پێ ی بوێری ، بۆیە چەندین شەو لەگەل ناوبراودا تا (٢ - ٣ ) بەیانی دانیشتن و شەونخونیمان بۆ کردووە ، هەروەها هونەرمەند ( مامۆستا سەلاح ڕەئوف ) یش لەکاتی نووسینەوەی نۆتەکان بۆ دواجار بە خەتە نایەبەکەی ، هەندێ جار تێبینی جوانی بەسوپاسەوە نیشان داوم . دوای ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەش ....... بەڕای خۆم هەندێ جار ، لە هەندێ لەو گۆرانی یانە ( نۆتە ) یەك یا زیاتر ، جێی متمانە نین ، واتە لێ ی بەشکم ، مەبەستم ئەوەیە بەم نۆتە ( یاچەند نۆتەیە ) بە تەواوی نەوێراوم و نووسینەوەکەی بەم شێوە نیە ، یا ڕەنگە وانەبێ بۆ ئەم جۆرە نۆتانە ، هەستاوم خستوومنەتە ناو دووکەوانەوە وەك : . . . یاخود . . . تاد .

هەروەها هەندێ هێماو نیشانەم واتە (علامات ) بەکارهێناوە کە لە سەرچاوەی زانستی یەوە وەرم گرتوون ،بۆئەوەی نۆتە فۆلکلۆریەکان زۆرترین سوود ببەخشن . وەك ئەمانەی خوارەوە :

١- (Gracenote) ئەم نۆتەیە کە (جوانکاری)یە ،ماوەی تا بڵێ ی کورتە .

٢- (گلیساندۆ - Glissando) مەبەست لە بەکارهێنانی ، ئەوەیە : ( لە نۆتەی یەکەمەوە ، بەخشین (واتە - زحف ) بۆ نۆتەی دووەم دەچین ) .

٣- دەسرازەی (Legato) کە بۆ بەستنەوەی چەند نۆتەیەك بەرکاردێت

٤- نیشانەی ( کرۆنا - Corona ) ؛ ماوەی ئەو نۆتەیەی ئەم نیشانەی بە سەرەوەیە ، لە ماوەی راستی خۆی درێژخایەن ترە .

زۆربەی ئەو ئاوازە فۆلکلۆری یانەی ناو ئەم کتێبە ، لەیەك ( پارچە واتە -مقطع ) پێك دێن و تادوایی هەڵبەستەکە هەر بەو ئاوازە دەگوترێتەوە ، بۆ ئەم جۆرە ئاوازانە پیتی (A) م لەبن کلیلێ (SOL) داناوە ، ئاوازیشمان هەیە ، دوای پارچەی یەکەم نزمەکەی دەگۆڕێ ، واتە گۆرانی یەکە لە دوو ( پارچە - مقطع ) پێك دێت بۆ ئەم جۆری دووەمەش دوای ئەوەی پیتی (A) م لەبن کلیلی (SOL) بۆ پارچەی یەکەم داناوە ، لە شوێنی دەست پێ کردنی پارچەی دووەم پیتی (B) م داناوە .

## ( ٢ ) رەزم (ئیقاع)

( رەزم ) : بەیەكێك لە كۆڵەكەكانی مۆسیقا دادەنرێ ، كە لەگەڵ (دەنگ ) بینای مۆسیقایان ( ئاوازیان ) لەسەر دەوەستێ . ڕەزمە كوردی یكانیش بەگشتی بۆ دوو جۆر یا لق دابەش دەكرێن :

أ - ڕەزمە ساكار یاخود سادەكان . (الایقاعات البسیطة ) .

ب - ڕەزمە تێكدراوەكان . ( الایقاعات المركبە ) .

ئەو ڕەزمانەش بەهۆی هەندێ هێماوە دەنوسرێن ، گەر كلكی (هێماكە - نۆتەكە ) بۆ سەرەوە چوو بوو ( ) بە (دم ) دەخوێنرێتەوەو گەر كلكی ئەو هێمایانەش بۆ خوارەوە شۆڕبوونەوە ( ) ( تەك ) یان پێ دەڵێن .

أ - (دم) : لە ناو (بارڕ)ی ( ڕەزم - ئیقاع ) دا شوێنی هێز نیشان دەدات .

ب - (تەك ) : لەناو ( بارڕ )ی ڕەزم دا ،شوێنی لاوازی یا ناسكی نیشان دەدات .

لە میانی ئەم (دم) و( تەك ) ا نەشدا ، هەندێجار پشوودان ، واتە ( سكتة ) مان هەیە ، كە عەرەبەكان بە ووشەی ( ئەس - أس ) دەی - خوێننەوە و منیش لەجیاتی ئەس ووشەی ( ووس )م بۆ داناوە .

ئێستاش وا لەخوارەوە ، ئەو گۆرانی یە فۆلكلۆری یانەی ناو كتێبەكەم لەسەری دەروات ، دەیانخەمە ڕوو :

١- ڕەزمی نیو ،یاخود (الوحدة المقسومة ) هێماكەش ( $\frac{2}{4}$ ) ە ، هەروەها بە زۆر ناوی دیكە هەیە ، وەك ( هەچەع ، الوحدة السائرة .... تاد ) ، لای ئێمەش ئەم ڕەزمە بە زۆر جۆر هەیە ، ناوی ( دەهۆڵی ) بە لقی دوو دەگوترێ وهەروەها ( دۆمی ) شی پێ دەڵێن .... تاد .

٢ - رەمزی ($\frac{4}{4}$) چوار لەسەر چوار کە ڕەزمی ( مەسموودی ) لیٚ دەردەچیٚت و گ ی دەسکاری تیادا دەکریٚت ، بۆ نموونە دەکریٚ بە ، ، تاد وەك نموونەی خوارەوە .

(١) $\frac{4}{4}$ دم تەك تەك تەك
(٢) $\frac{4}{4}$ دم دم دم تەك دم تەك ووس ووس ووس

(ڕەزمی چوار لەسەر چوار)

٣ - رەزمی ($\frac{6}{4}$) شەش لەسەر چوار کە میللەتانی دەوروبەر ( سەنگین - سەماعی ) پیٚ دەڵیٚن : بروانە نموونەی خوارەوە :

(١) $\frac{6}{4}$ دم تەك تەك تەك دم تەك
(٢) $\frac{6}{4}$ دم كە تە كە تە دم تەك

ڕەزمی (سەنگین سەماعی)

٤- ڕەزمی ( $\frac{6}{8}$ ) شەش لەسەر هەشت کە ئیٚمە ( شایی ) و میللەتی دی رۆژهەلات ( یورك سەماعی ) پیٚ دەڵیٚن : وەك خوارەوەیە

(١) $\frac{6}{8}$ دم تە تەك تەك تەك تەك
(٢) $\frac{6}{8}$ دم تە تەك دم تەك ووس

ڕەزمی (شایی)

٥ - رەزمی ($\frac{10}{16}$) دە لەسەر شازدە کە بە ( جۆرجینا ) دەناسریٚ ، وەك خوارەوەیە :

(١) $\frac{10}{16}$ دم تەك تە دم تە تەك
(٢) $\frac{10}{16}$ دم تەك دم تەك

ڕەزمی (جۆرجینا)

٦ - رەزمی (   ) سێ لەسەر هەشت کە بە ( سەماعی سەربەند ) ناسراوە ، بڕوانە نمونەی خوارەوە :




سەرچاوەکانی ئەم شیکردنەوەیە


١- (حبيب ظاهر العباس ) کتێبی ( نظريات الموسيقى العربية ) ساڵی (١٩٨٦) لە (بەغدا ) لە ( دار الحرية ) بە چاپ گەیشتووە .

٢ - (أسعد محمد علي ) کتێبی ( في أصول الموسيقى الفولكلورية ) ساڵی ( ١٩٧٦ ) لە ( بەغدا ) لە ( دارالساعة ) بە چاپ گەیشتووە .

٣ - ( حسين قدوري ) کتێبی ( لعب واغاني الاطفال ) بە شی دووەم ، ساڵی ( ١٩٨٤ ) لە بەغدا لە ( دار الحرية ) بە چاپ گەیشتووە .

## فایلێکی تایبەت بە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی

## ژمارە -١-

| | |
|---|---|
| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | عەلی مستەفا سالح بەناو بانگە بە ( عەلی بادینی )<br>ساڵی ١٩٤٨ ی ز لە گوندی (دارەبەن )ی سەر بە<br>(گەردی )یان لەدایك بووە |
| چ جۆرە گۆرانی یەك<br>دەزانیٚ هیچ ئامێرێکی<br>مۆسیقا دەژنیٚ | گۆرانیەکانی کارکردن وەك دروونەو ساوار کوتان و هند<br>دەزانیٚ لەگەڵ هی شایی وهەڵپەڕکیٚ . لەزووەوە حەزی کردووە<br>گۆرانی تۆمار بکات لە ئێسگە و تەلەفزیۆن بەلاَم بۆی رێك<br>نەکەوتووە . — نەخێر |
| ئەم گۆرانییە لەچ<br>شوێنێك و لەچ<br>کەسێك فێر بووە؟ | لەکوردان فێری بووە دەڵیٚ کاتێك لە<br>گوندەکانی دی خەڵکی دەهاتن بۆ (زەبارە -<br>هەرەوەز ) یەکسەر لەدەمی شایەرانەوە لەبەرم<br>دەکردو دەچومە لای شایە رەکان بۆ ئەوەی<br>بەتەواوی لێیان وەرگرم و فێری بم . |
| کات وشوێنی<br>تۆمارکردنەکەو<br>تێبینی ، گەر هەبوو | ١٩٨٥/٧/٩ لەماڵی خۆمان / هەولێر بەمنداڵی لە ناوچەی<br>(گۆمەزەردی) بادینان بووە، هەر بۆیەشە ناو بانگی (عەلی<br>بادینی) یە ، بەلاَم دەڵیٚ بەبیرم نایی لەویٚ هیچ فێر بووبم . |

## فـایلێکی تایبـەت بـە گۆرانـی فۆلکلـۆری کــــوردی

### ژمـــاره -٢-

| | |
|---|---|
| نـــــاو<br>تەمـــــەن<br>ڕەگـــــەز | حەمەدەمین باپیر حەمەدی گەردی تەمەن ٥٥ سـاڵە خەڵکی ناوچەی گەردی یە گونـدی (ئاشـۆکان ) بـەلاّم لـە گونـدی (گەزنـە) لـەدایك بـــووه . |
| چ جۆره گۆرانی یەك دەزانیّهیچ ئامێرێکی مۆســیقا دەژنـــیّ | لاوك بەستە بـەلاّم خـۆی (لاوك) ی زۆر مەراقــــــەو شـــــــەیدایەتی<br>نـــــەخێر |
| ئەم گۆرانییـە لـەچ شــوێنێك و لـــەچ کەسێك فێر بووه؟ | لەخـەڵکی ناوچەکـە واتـە هـەر لـــەکوردان فــێری بـــووه . |
| کـــات وشـــوێنی تۆمارکردنەکـــەو تێبینی ، گەر هەبوو | ١٩٨٤/٥/٢٩ لــە مەڵبــەندی چـــالاّکی قوتابخانـــــەکانی هـــــــەولێر |

فـايلێکی تايبـەت بـە گۆرانـی فۆلکلۆری کــــوردی

ژمـــاره -٣-

| | |
|---|---|
| نــــــاو<br>تەمــــــەن<br>ڕەگـــــەز | ڕەسول محەمەد عەبدولاّ (ڕەسول گەردی ) ساڵی ١٩٢٦ ز لە گوندی (قەلاّتگە ) ی ناو گەردی يا يەتی کە لەبن (نزيك ) هەولێرە لـە دايـك بـووە . |
| چ جۆرە گۆرانی يەك دەزانیٚهیچ ئامێرێکی مۆســـیقا دەژنـــیٚ | حــــەيران<br>لاوك<br>بەســـــتە<br>نــــــەخێر |
| ئەم گۆرانیيـە لـەچ شــوێنێك و لـــەچ کەسێك فێر بووە؟ | گۆرانيەکان لە هەولێر خەزنە ، تـەرجان ، دزەيـی ، سييان ، مامەسێنی يـەو گـەردياتی ئەمـە دەشـــتی هەولێرە جيايە لەگەڵ دەشتی قـەزاج ، هـەروەها بـە منداڵـی لـە شـايیان فـێری زۆر گۆرانـی بـووە وەك (ئەلەززە،چارۆگە و چارۆگە ) کە شـايی شـێخانی لەبەر دەکریٚ . |
| کـــات وشـــوێنی تۆمارکردنەکـــەو تێبينی ، گەر هەبوو | ١٩٨٠/١/١٨ هــەولێر مــالی خۆيــــان |

## فـايلێكی تايبـەت بـە گۆرانـی فۆلكلۆری كـــــوردی

## ژمـــــاره -٤-

| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | مەغديد حەمەد زراری تەمەن ٤٦ ساڵە سەر بە عەشیرەتی (زراری) یە کە لە دەوری (سەلاحەدین) نیشتە جێن . |
|---|---|
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانیٚ‌هیچ ئامێرێكی مۆسیقا دەژنیٚ | گۆرانی جۆراو جۆر دەزانیٚ بەلاٚم خۆی حەز لە گۆرانیەكانی درۆینە دەكات .<br>نەخێر |
| ئەم گۆرانی‌یە لەچ شوێنێك و لەچ كەسێك فێر بووە؟ | زووربەی ئەم گۆرانیانە لە باوكی خۆی فێر بووە . |
| كات وشوێنی تۆماركردنەكەو تێبینی ، گەر هەبوو | لە ١٩٨٣/٨/٢٢ لە هەولێر لە مالی خۆیان تۆمار كراوە . |

## فایلێکی تایبەت بە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی

### ژمارە -٥-

| | |
|---|---|
| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | زرار عەبدولرەحمان حاجی قادر ساڵی ١٩٦٥ لە گوندی (سووسێ) سەر بە ناوچەی خۆشناوەتی لەدایك بووە . |
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانێ هیچ ئامێرێكی مۆسیقا دەژنێ | گۆرانی سواوار کوتان<br>ئامێری شمشاڵی ئاسن |
| ئەم گۆرانییە لەچ شوێنێك و لەچ كەسێك فێر بووە؟ | لە دەورووبەر واتە لە کوردانەوە فێر بووە . |
| كات وشوێنی تۆمارکردنەکەو تێبینی ، گەر هەبوو | ١٩٨٤/٨/٢٢ ڕۆژی چوار شەم کات (٨,٣٠) بەیانی لەناو ڕەزی خۆیان لە گوندی (سووسێ) ی بن چییای (سەفین ) ئەنجام دراوە . |

# فـايلێكی تایبـەت بـە گۆرانـی فۆلكلـۆری كــــوردی

## ژمـــارە -٦-

| | |
|---|---|
| نـــــاو<br>تەمــــــەن<br>ڕەگـــــەز | ئەسعەد ڕەحمان وەیسە تەمەنی ( ٥٠ ) ساڵە |
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانیٚ هیچ ئامێرێكی مۆســیقا دەژنــیٚ | گۆرانیـــەكانی كــاركردن .<br>نـــــەخێر |
| ئەم گۆرانییە لـەچ شــوێنێك و لـــەچ كەسێك فێر بووە؟ | هــەر لەخــەڵكی گوندەكــەی خــۆی و گوندەكــانی ناوچەكــە فــێری بـــووە . |
| كـــات وشـــوێنی تۆماركردنەكـــەو تێبینی ، گەر هەبوو | ١٩٨٤/١٠/٥ گونــدی (ســـەیدعوبێد ) |

# فایلێکی تایبەت بە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی

## ژمارە -٧-

| | |
|---|---|
| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | عومەر ڕەشید ئەحمەد بێتواتەیی<br>ساڵی ١٩٢٩ ی ز هەر لەبێتوانە<br>لەدایک بووە |
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانیٚ هیچ ئامێرێکی مۆسیقا دەژنیٚ | دیارە هەر ئەوچەن گۆرانی یەی خوارەوە بە باشی دەڵێت .<br>١. پردیٚ باسان .<br>٢. لێنێن وان باران .<br>٣. هاتەوە تەیرۆکەی گەرمێنیٚ .<br>٤. گەردن زەرد.<br>٥. مارەکیٚ لیٚ نا<br>نەخێر |
| ئەم گۆرانییە لەچ شوێنێك و لەچ کەسێك فێر بووە؟ | هەر لە بێتوانەو دەورو بەری واتە لە کوردان فێریان بووە . |
| کات وشوێنی تۆمارکردنەکەو تێبینی ، گەر هەبوو | ١٩٨٤/٦/١٢ لە گوندی سەرووچاوە |

# فـايلێكی تایبـەت بـە گۆرانـی فۆلكلۆری كــــوردی

## ژمـــاره -٨-

| | |
|---|---|
| نـــــاو<br>تەمــــەن<br>ڕەگـــەز | زلێخــا محەمــەد ســاڵح دیـاره<br>ئافرەتــەو تومــەنی ٥٠ ســـاڵە |
| چ جۆره گۆرانی یەك دەزانیٚ هیچ ئامێرێكی مۆســیقا دەژنـــیٚ | گۆرانـــی كــــاركردن وەك (دروونـــە ،مەشـــكەژەنی ،دەســـتاڕ، هتــــد)<br>نـــەخێر |
| ئەم گۆرانیـیە لـەچ شـــوێنێك و لــەچ كەسێك فـێر بووه؟ | لـە گونـدی(مەلاكاغـە ) ولـە خـەڵكی ناوچەكە كە كوردن و بـە تایبـەتی لـە (سرێمان تەها بەڕا ، شەلە) كە شایەره فێریــــــان بـــــــووه . |
| كــات وشــوێنی تۆماركردنەكــەو تێبینی ، گەر هەبوو | ١٠/٥/١٩٨٤ لـە گونـدی (خەزنەی مەلا بـەكری ) . |

# فایلێکی تایبەت بە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی

## ژمارە -٩-

| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | ئەحمەد سامی ڕەشید ئەحمەد<br>ساڵی ١٩٣٣ ز لە گوندی<br>بێتواتە لە دایك بووە . |
| --- | --- |
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانیٚ هیچ ئامێرێکی مۆسیقا دەژنیٚ | گۆرانی ١. پردیٚ باسان ./٢.لێنێن ./٣.مارەکیٚ لیٚ نا ./٤.گەردن زەرد ./٥.هاتەوە تەیری گەرمێنی .دیارە حەزی لە هەموو گۆرانی یەکی ڕەسەنە کە تام و بۆی کوردی لیٚ بێت .<br>نەخێر |
| ئەم گۆرانی‌یە لەچ شوێنێك و لەچ کەسێك فێر بووە؟ | گۆرانی یەکان لە کوردان فێربووە.زۆر بە باشی لە مەلا حەسەن ناوێك کە نزیکەی ١ ساڵە مردووە و تەمەنی نزیکەی ٩٠ ساڵ بووە . ئیشی ناو براو توونەوانی بووەو مەلاش نە بووە بەڵام مەلا حەسەن ناو بانگی بووە ، دەنگیش یەکجار کاریگەرو بەسۆز بووە . |
| کات وشوێنی تۆمارکردنەکەو تێبینی ، گەر هەبوو | ڕۆژی سیٚ شەموو ڕێکەوتی ١٩٨٤/١١/٢٠ لە شاری کەرکووك .لەوەرامی پرسیارێکی مندا کاك سامی گوتی (بەنسبەت ناوی پردیٚ باسان) ە وە لە وانەیە پردیٚ بلباسان بووبیٚ و بۆ سووکی بووبێتە (باسان)، یانیش کە خەڵکی ویستوویانە دەنگ و باسان بزانن چوونەتە سەر پردەکە چوونکە ڕیٚ ڕەوی خێلە سات بوە. پردەکەش دەکەوێتە بەینی دزار گەلی و دیلمان |

## فـايلێكی تایبـەت بـە گۆرانـی فۆلكلۆری كـــوردی

## ژمـارە -١٠-

| | |
|---|---|
| نــــاو<br>تەمـــــەن<br>ڕەگــــەز | فەوزی بەگ كوڕی ڕەشید بەگ تەمەنی (٦٠) ساڵ زیـاترە لـە بێتواتـە لـە دایـك بـــووە . |
| چ جۆرە گۆرانی یەك دەزانیٚ هیچ ئامێرێكی مۆســیقا دەژنـــیٚ | دیسانە وە ئەویش هەر هەمان گۆرانی بۆ گوتین واتـە :١. پردیٚ باسان ./٢. لێنین وان بـاران ./٣. هاتـەوە تەیرۆكـەی گەرمێنیٚ./ ٤. گەردن زەرد ./٥.مارەكیٚ لیٚ نا .<br>نـــــەخێر |
| ئەم گۆرانییـە لـەچ شـــوێنێك و لــەچ كەسێك فێر بووە؟ | هـەر لـە ناوچـەی بێتوانـە فێریـان بـــووە . |
| كــات وشــوێنی تۆماركردنەكـــەو تێبینی ، گەر هەبوو | ڕۆژی ١٩٨٤/٦/١٢ لــە گونـــدی (سەرووچاوەی ) سەر بە خۆشناوەتی ئەنجام دراوە . |

## فـايلێكى تايبـەت بـە گۆرانـى فۆلكلـۆرى كــــوردى

## ژمــاره -١١-

| ناو<br>تەمەن<br>ڕەگەز | جەلال سەعيد عەبدوللا نازناوى شاعيرى ( جەلال جۆبار ) ە سالّى ١٩٢٩ ى ز لەشارى كۆيـە دا لـە دايـك بـووە . |
|---|---|
| چ جۆرە گۆرانى يەك دەزانیٚ‌هیچ ئامێرێكى مۆسيقا دەژنیٚ | جۆراو جۆر گۆرانـى دەزانـیٚ و حـەزيش لـە گۆرانـى يـەكانى كـار كـردن دەكـات .<br>نـەخێر |
| ئەم گۆرانىيـە لـەچ شـوێنێك و لـەچ كەسێك فێر بووە؟ | زۆربەى گۆرانيەكانى لە دەمى فەقى يـەكانى ناوچەى دەشتى هـەولێرو كۆيـە فێر بووە . |
| كات وشوێنى تۆماركردنەكەو تێبينى ، گەر هەبوو | شەوى ١٩٨٠/٦/١٦ لە مالّى خۆيان لە كۆيە و بە ئامادە بوونى هونەر مەندو گۆرانـى بێژ كاكـە ئـەنوەر تـاهير. |

# ( ســــوپاس )

شایانی باس و ڕێزگرتن و جێگەی سوپاسی بێ پایانیشه :
كه نۆته‌كانی ناو ئه‌م كتێبه‌ی بەر دەستتان ، هەر هەمووی ، لە لایەن هونەرمەندی لێهاتووی كورد (ئەنوەر قەرەداخی ) ئەركی پیاداچوونەوەی ئەنجام دراوه و .....
ئەركی بە خاوێنی و بۆدواجار نووسینەوەشیان لە لایەن هونەرمەندی لێهاتوو ( مامۆستا سەلاح ڕەئووف ) جێ بە جێ كراوەو هەندێ جار لە كاتی نوسینەوەیان بۆ چوون و تێبینی جوانیشی نیشان داوه ، دیسانەوە هونەرمەند ( ڕەهبەر كۆیی ) یش ئەركی كێشانی تاباۆی بەرگەكەی كێشاوه .
بۆیه منیش لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم ....... هونەری كوردیمان خاوەنی دوا ڕۆژێكی گەلێ ڕووناكه ، چونكه خاوەنی هونەرمەندانی وەك ئەوانەی سەرەوەیه ، ناوبراوان زۆر خۆش بەختانەو بێ دوودڵیو كەم تەرخەمی شەونخوونی بۆ دەكەن و بە تەنگ خزمەت كردن و بەرەو پێش بردن و پاراستنیەوەن .
هەروەها پڕبەدڵ سوپاسی برای ئازیز ( نەجات خۆشنووس ) دەكەم چونكه ئەركی نووسینی ناونیشانی (شیكردنەوەی مەقامەكان ) و نووسینی زانیاری ( نێو فایلەكانی ) گرته ئەستۆی خۆی .
هەروەها زۆر سوپاسی كاك عوسمان پیرداود دەكەم كە یارمەتی‌یەكی زۆری دام لە دەرهێنانی هونەری و صاپ كردن.
سوپاسی هەموو ئەوانەیش دەكەم ، كەم یا زۆر بۆ جوان نیشان دان و دەرخستن و بە چاپ گەیاندنی ئەم كتێبه هەوڵیان دابێت .لە ناوهەموو ئەوانەیش دا برای خۆشەویستم هونەرمەند / شێرزاد محەمەد حوسێن و هونەرمەند و (جمال مشیر).

# " پێرســـــت "

## له چاپكراوه‌كانی وه‌زاره‌ت سالی ١٩٩٦

١- میكانیزمه بنه‌ره‌ته‌كانی رسته‌سازی ........................................ د. شێركۆ بابان

٢- سه‌عید زه‌بۆكی لای خۆمان . . . رۆمان ........................................ كه‌مال سه‌عدی

٣- البعد القومي للتغيرات في حدود الادارية لمحافظة كركوك .................... د. خليل اسماعيل محمد

## لە چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی ١٩٩٧

١- کـــاولاش ........... رۆمـــان ................................ عبداللـــە ســـــراج

٢- مـەم و زیـن ............................................ عـەلی فـەتاح دزەیـــی

٣- پشـکۆ و خۆڵـەمێش ......................................... ئـازاد عبدالواحیـــد

٤- دەردەو کـــورد ................................................... مـــەحمود زامـــدار

٥- باڵـــــەبان ................................................... وریـــا ئەحمـــــەد